# سەنا و سکاڵا

دانراوی
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

ئانا ـ موساسیر
٢٠١٢ی زایینی

سرشناسه: مدرس، عبدالکریم، ۱۲۸۳ - ۱۳۸۴.
عنوان و نام پدیدآور: سەنا و سکالا/ عەبدولکەریمی مودەرریس. .
مشخصات نشر : تهران: آنا ؛ مهاباد : موساسیر، ۱۳۹۰.
مشخصات ظاهری: ۲۰۷ص.
شابک: ۹۷۸-۶۰۰-۶۲۹۲-۰۷-۶
یادداشت: کردی.
موضوع: شعر کردی -- قرن ۱۴
رده بندی کنگره: PIR۳۲۵۶/ س۷۴۳م۳۴۵ ۱۳۹۰
رده بندی دیویی: ۸فا۹/۲۱
شماره کتابشناسی ملی: ۲۳۷۲۶۶۲

نشر آنا

○ ناوی کتێب: سەنا و سکالا ○ دانەر: عەبدولکەریمی مودەڕڕیس ○ ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان: زاهید وەیسی ○ ڕووبەرگ: ئەفشین بەهاریزەڕ ○ سەرپەرشتی چاپ: شوانە تاهیری ○ ساڵ و جاری چاپ: ۱۳۹۱/ یەکەم ○ ژمار: ۲۰۰۰ دانە ○ پەخشانگا: ئانا ـ مووساسیر

# پێڕست

بسم الله الرحمن الرحيم

## بەشی یەکەم: سەنای ڕەهبەر

بە (بسم الله الرحمن الرحيم)
بە حەمد و سەنای پڕ سیدق و تەسلیم
ستایش ئەکەم، بۆ خودای عەلیم
ئەپاڕێمەوە، لە خودای کەریم
جا درووديکی سەییدی سەروەر
کە (محمد)ە و ئەحمەدە و ئەنوەر
بە سروودی خۆش، بە یاسای ئیسلام
پێشکەشی ئەکەم سەلات و سەلام
بۆ خۆ بۆ برای زومرەی ڕەهبەران
تا ئەڕژێتە خوار دوڕ دانەی باران
بۆ پەیڕەوانی، لە ڕۆزگاران
تا ئەڕژێتە خوار دوڕدانەی باران
ئەمجار براکان، نووری چاوانم
قووەتی ڕۆح و قووتی ژیانم
بۆم هۆنینەوە بە عەونی خودا
بە دەستی ئیخلاس، بە زەوق و سەودا
ئەوسافی ڕەهبەر سەییدی عالەم
لە سەر بانی دڵ، بیکەن بە عەلەم
بیکەنە بەرتان (خیر الكلام)ە
بیکەنە سەرتان، تاجی ئیسلامە

(سەنای ڕەهبەر)ە، ئەخوێنرێتەوە
دڕ و گەوهەرە، ئەهۆنرێتەوە
ڕشتەی زمڕووتە، بیکەنە گەردن
بە وێنەی قووتە، بۆ کاتی مردن
لە بۆ کوڕ شیرە، بۆ کچ قەلادە
هەر کەسێ پێی بێ، لە شەڕ ئازادە
بە جەماوەری بۆ موناسەبات
بیخوێننەوە وێنەی سەلاوات
بیسێننەوە بە دەنگێکی خۆش
تا بە تاوی نوور دڵتان ببێتە جۆش
جا دوعایەکیش بکەن بۆ (نامی)
تا بمرێ لە سەر ڕێگەی ئیسلامی
یادگارێکە، بمێنێ لاتان
بۆ یادی برای نیوە مەلاتان
نوورت کەوتە سەر سەراسەر ئافاق
تەواو بوو دەورەی دائیرەی ئەخلاق
بووی بە هۆی تەوحید بۆ خودای مەعبوود
تەوحیدی غایە و تەوحیدی مەقسوود
دەی بۆ خاتری سەفای ڕوخسارت
لە بەر وافیری فەیزی ئەنوارت
بە دڵ بڕوانە بۆ دڵی (نامی)
موونەووەر ببێ بە نووری سامی

## موژدەی پێغەمبەران بە تۆ

ئەی سەروەرەکەی ئەسفیای عالەم
ئەی ڕەهبەرەکەی بۆ عیززەت عەلەم
تۆ بووی مەبەستی خودای بێهەمتا
لە خەلقی عالەم کاتی سەرەتا
ئادەم ناوی تۆی کرد بە وەسیلە
بۆ عەفوی خەتا و فەوزی فەزیلە
تۆی مەبەس لە ناو دوعای خەلیلا
بە ئایەی (وابعث فیهم رسولا)
یانی لە (وابعث فیهم رسولا)
مەبەس بووی لە ناو (دال) و (مدلول)ا
زوو موژدە درا بە ڕیسالەی تۆ
بە پایە و مایە و بە جەلالەی تۆ
بۆ تۆ پەیمانی بەستوە خودا
لە وەختی خۆیا لەگەڵ ئەنبیا
مادام ڕەهبەران بێن و بتبینن
بە ڕیسالەتت ئیمان بهێنن
(موسی) موژدەی دا و (عیسی) بەشارەت
بە ڕیسالەی تۆ، نەس نەک ئیشارەت
خۆت و ئوممەتت وان لە ئەسفارا
سیفری ئەشعیا وا لە ئیزهارا
وەسفت مەعرووفە، لە لای عاریفدا
لای خاوەن بەهرە، لە مەعاریفدا

دەی بـــۆ ئـــەســـالەی وجـــوودی پاکـــت
لــە بــەر ڕیــسالەی ئــەرز و ئــەفلاکــت
دوعـــا بفـــەرمـــوو هـــەتـــاکوو (نـــامی)
خـــادیم بـــێ لـــەبـــۆ دیـــنی ئیـــسلامی
ئـــەی نـــووری ڕۆژی پـــیرۆزی عالـــەم
ســـرووری ســـینەی پرســـەفـــای ئـــادەم
هـــەتـــاوی پـــڕتاو لـــە ســـەر (خـــافقین)
(بـــین المغـــربین، بـــین المـــشرقین)
ڕوونـــاکیی هـــەمـــوو جیهـــان ســـەراســـەر
مایـــەی ڕوونـــاکی بـــۆ پـــەری و بـــەشـــەر
ئـــەی ئـــاڵای بـــەرزی بـــە قـــەدر و قیمـــەت
پایـــە پـــیرۆزی بـــە هێـــز و هیممـــەت
ئـــەی ســـەرچـــاوەکـــەی کـــەرەم و ئیحـــسان
ئـــەی خـــۆش‌نـــاوەکـــەی عالـــەمـــی ئینـــسان
لـــە ئـــەرزا نـــاوی بـــەرزت (محمـــد)
لـــە ئاسمانیـــشا (محمـــود) و (أحمـــد)
مـــەنبـــەعـــی نـــووری تـــەســـدیق و ئیمـــان
مـــەجمـــەعـــی وەفـــا و شـــەرەف و ئـــەمـــان
ئیمـــامی بـــە حـــەق بـــۆ هـــەمـــوو ئوممـــەت
هومـــامی موتـــڵەق بـــۆ عـــیلم و حیکمـــەت
پـــڕە لـــە ئـــەســـرار کـــە زاتی بـــاری
ئـــەتـــۆی نـــارد لـــەگـــەڵ نـــەخوێنـــدەواری

نـــەخوێنـــدەواری بـــوو بـــە چـــارەی تـــۆ
خـــاوەن ئـــەنـــواری بـــوو بـــە بـــارەی تـــۆ
ئەگەر ئـەتنووسـی بـە دوو پـەنجـەی ڕاس
جێی گومان ئەبووی بـۆ ئـەهلـی وەسـواس
نامـــەی نووســـیوە لـــە لای نووســـەران
کتـــێبی دیـــوە لـــە لای دیگـــەران
خـــودا بـــە جـــۆرێ تـــۆی کـــردە ڕەهبـــەر
پـاک و خـاوێن بی لـەم سـەر و لـەو سـەر
پـەنجـەی تـۆ تـەنیـا لـەبـۆ تـەوحیـدە
بـــۆ شـــەهـــادەتی خـــودای حـــەمیـــدە
بـــۆ ئیـــشارەتی لـــەت کـــردنی مانـــگ
بـــۆ لـــە گـــوێ نـــانی کـــەلیمـــاتی بانـــگ
بـــە بـــارێتـــرا ئـــەگـــەر بـــڕوانین
سـیرڕی ئـەو کـارە بـە حـەق ئـەزانـین
تـــۆ ســـیاناری لادەی لـــە عالـــەم
چـون سـیاکاری ئـەکـەی بـە قـەڵـەم
بـۆ ڕوونـاکیی عـام تـۆ کـە بـووی بـە هـۆ
چلـــۆن تـــاریکی دەرئـــەچـــێ لـــە تـــۆ
تـــــۆ تکاکـــــاری تاوانبـــــارانی
بـۆ بـەهـرەی ڕەحمـەت وەکـوو بـارانی
بـــاران خـــەتی ڕەش ئـــەکوژێنێتـــەوە
گولـــی ڕەنگـــاوڕەنـــگ ئـــەژیێنێتـــەوە
کـە تکـای تـاوان بـۆ ئـەو بـوو بـە بـەش

هــــۆی لابـــردنی ڕەشــــی لــــە چـــارە
ڕەش ناکاتـــــەوە نامــــــەی ئـــــاوارە
ئەی سایەی ڕەحمـەت بـۆ هـەمـوو عالـەم
فریـــــشتە و پـــەری تـــا بــــەنیئـــادەم
دەســـت و پـــێ ســـپی و چـــارە نـــوورانی
تـــاجی شــــەرەفی ســــەری ئینـــسانی
(قائـــــــد)ی (غــــــر)ی (محجلـــــین)ی
گــــەورەی ئــــەنبیـــا و هـــەم مورســـەلـــینی
ئـــەی ئاسمــــانی بـــارانی ڕەحمــــەت
بـــۆ ڕوانـــــدنی ئیحـــسان و هیممـــــەت
ئـــەی دەریـــای هـــادی پـــڕ لــە جـــوامێر
خـــاوەن ئـــەنـــواری بـــاتین و زاهـــیر
ئـەی تینـەت پـاکی عونـسور بـە سـەفـا
ئـــەی دڵڕوونـــاکی پڕعــــەهـــد و وەفــــا
تـۆ بـووی بـە ڕەهبـەر بـە ئـەمـری خـودا
ئـــادەم عونـــسور بـــوو لـــە ئـــاو و گـــڵدا
ڕۆحـــت بـــە وەفـــا ڕۆحـــی ئـــەرواحـــە
جیـسمت بـە سـەفـا چـرای ئـەشـباحە
لـــەو لاوە ئـــەوەڵ لـــەبـــۆ ڕەهبـــەران
لــــەم لاوە ئـــاخر بـــۆ پێغـــەمبـــەران
خـــودا کـــە ویـــستی تـــەنـــویری جیهـــان
هــــەتـــا دەرکـــەوێ ئـــەســـراری پـــەنهـــان
هـــەتــاوی ڕووی تـــۆی هێنـــا لـــە ئافـــاق
تـــا عالـــەم بگـــا بـــە نـــووری ئـــەخـــلاق

هاتی جیهانت پڕ کرد لە ئەنوار
بە عیلم و زانست بە پاکی کردار
لە ڕێی دوورەوە هاتی بە ئارام
بۆیە گەیشتی بە مایە و مەرام
بە ڕۆح ئەووەڵ بووی، بە جەسەد ئاخر
بووی بە دارای نوور باتین و زاهیر
ڕێگەکەت دوور بوو، کەوتیتە درەنگ
ووی بە گوشادی بۆ دەروونی تەنگ
ڕۆحەکەت گەڕا بە ئەنبیادا
بە پشتی پاک گشت ئەسفیادا
بۆیە ئەخلاقی هەمووت کەوتە دەست
بووی بە سەرکردەی گەلی حەقپەرست
بۆ دین و دونیا ئازاد و سەربەست
بە خولقی چاک و بە پاکی مەبەست
بێباک لە عالەم، ئیللا لە خودا
بۆ دینی تەوحید، دەروون بە سەودا
کەس بە وێنەی تۆ، نەهاتە عالەم
ڕەهبەر بێ لەبۆ گشت بەنیئادەم
ڕۆحت لە خەتا خاوێن و بەری
بووی بە ڕەهبەری ئینسان و پەری
خوا ویستی ببی بە قائیدی عام
بۆیە ناردیتی، لە ئاخر ئەییام
بە سروشتی پاک، بە ڕەوشتی چاک
سەرکەوتی لە سەر بورووجی ئەفلاک

دڵــت لــە وەزنــا مــەرکــەزی ئــەرزە
ڕۆحیـــشت تـــاجی فریـــشتەی بـــەرزە
چـەنـد سـەنـا بکـرێ، بـە دڵ و بـە دەم
کـەمـە بـۆ سـەنـای ڕەهبـەری ئـەکـرەم
یانێ (محمـد) (ص)، خـاوەن تـەخـت و تـاج
تاقـەسـوارەکـەی شـەوەکـەی میعـراج
بم بـــە قوربـــانی نـــاو و نیـــشانت
بـــەلاگـــەردانی نیـــشانەی شـــانت
لا بکـــەرەوە بـــە لای (تـــامی)دا
بـەڵـکوو پێـشکەوێ لـە ئیـسلامیدا
بـێبـاکی دونیـام تـۆم پـشتیوانی
بێغـەم لـە دەریـام تـۆم کـەشـتیوانی
ئەی ئەسڵی نوسخەی هەمـوو مـەوجـوودات
بـە ڕۆح و بـە لـەش بـە ئـەوسـاف و زات
لـە بـەر شـەریفـی وجـوودی پاکـت
لـە بـەر لـەتیفـی دڵـی ڕووناکـت
بـە پـاکی لـە بـای تـەپ و تـۆز و گـەرد
بـەری لـە هـەوای نـەخوشـین و دەرد
لـە (آدم)ەوە تـا بـە (ابـراهیم)
بـە پـاکی هـاتی لـە تـۆزی تـەوهـیم
لـە ئـەسـڵی ئـەسـیل ئابـا و ئومـمـەهـات
بـە عـەقـدی نیکـاح هـاتی بـۆ بـسات
لـە خـەلیلـەوە بـە شـێوەی تـەبجیـل
کـەوتیتـە پـشتی بابـا (اسـماعیل)

لــەوێ بــۆ قــەیــدار لــەوێ بــۆ عــەدنــان
لــەوە بــۆ (قــصی) قــورەیــشی عینــوان
لـــەوێ هاتـــە خـــوار بـــۆ (عبـــدالمناف)
لــەوێ بــۆ هاشــم ســەیــدی ئــەشــراف
لـــــەوێ بـــــۆ بـــــاپیر (عبـــــدالمطلب)
جــا بــۆ (عبـــدالله)ی عـــالی مـــەراتیـــب
لـەگـەڵ ئامینـەی مـەحرووسـەی وەهـەب
لـە (عبـدالمناف)، زوهـرەی خـۆش‌نـەسـەب
ساڵی پێـنج سـەد و حـەفتـا و یـەک ڕەسـا
مێـــژووی مـــیلادی حـــەزرەتی عیـــسا
ساڵـی هێرشـی (ئـەبـرەهـە)ی عـەلیـل
بــۆ (كعبـــەالله) لـــەگـــەڵ ســوپا و فیــل
بیــستی نیــسانی ڕۆمـــی بـــە شـــەرقـــی
هاتـــە دونیـــاوە ڕەهبـــەری بـــەرقـــی
دوازدەی مـــــــانگی (ربیـــــــع الاول)
بـــەرەبـــەیـــانی دووشـــەممـــەی ئـــەفـــزەل
دونیــای ڕوونــاک کـرد، بــە نـووری زاتی
بـــە بـــەرزی ئـــەخـــلاق، بـــە کـــەرامـــاتی
ســـا ئـــەی پـــیرۆزی ئافـــاقی جیهـــان
خـــاوەن ڕیـــساڵەی زاهـــیر و پـــەنهـــان
بـــە دڵ بڕوانـــە، بـــۆ دڵـــی (نـــامی)
هـــەتـــاکوو دەرچـــێ، لـــە شـــێوەی خـــامی

## ناو دانان و پەروەردەی منالیی

چــون خــودا ویــستی بـۆ غایـەی تـەهزیـب
خـۆی تـەمێـت بکـا بـە خولـق و تـەئـدیب
لە ڕەحـەمـدا بـووی باوکـت بـە ڕەحمـەت
دەرچـوو لــە دونیـای پڕجـەفـا و زەحمـەت
جـا بــۆ تــەفــائول بــاپیری ئــەمجــەد
لــە ســەر ئیلــهامی بــارەگــای ســەمــەد
(محمـــد)ی کـــرد بـــە نــاوی بـــەرزت
تـا سـەنـات بـۆ بـێ لـە سـەمـا و ئـەرزت
بــە شــیری دایــک و شــیری (ثویبــە[1])
ژیــوارت ئــەکــرد نــەوبــە بــە نــەوبــە
هــەتـا (مـصدر)ت مـادەی سـەعـدی بـێ
تــا ســەعــادەتــت بــە ئــەبــەدی بــێ
حــەلیمــە نــاوی ســەعدیــە نــەســەب
هـــاتو بـــردیتی بـــۆ بـــەدوی عـــەرەب
جــا بــە شــیری پــاک دوو سالــی تــەواو
بــەخێــوی کـــردی تـــا هاتیتـــە نـــاو
جــا بــە خــاوێنی لــە گــەرد و لــەکـە
تــۆی هێنایــەوە بــۆ شــاری مــەککــە
لــە بـەر پـیرۆزی و بـەرزی و تـەقـدیرت
زۆر پاڕایـــــەوە لـــــە لای بـــــاپیرت
کـــە بتباتـــەوە هـــۆزی هـــەوازیـــن
کــە عــەشــرەتێکــی خــاوەن ئیعــزازن

---

١. ثویبە: جاریەی (أبولهب)ی ماهی پێغەمبەر بوو.

پـاش بردنــەوەت سالــی چــوارەم ســاڵ
جیبریـل هاتـە لات بـۆ بـەهـرەی ئیقبـاڵ

سینەی لەت کـردی و پـڕی کـرد لـە نـوور
کــردی بــە چــرا بــۆ نزیــک و دوور
ئەمجـار حـەلیمـەی بـە عـەقڵ و کـەمـاڵ
بـە کـزەی جگـەر بـە سـۆز و ئـەحـواڵ
هــەســتا و هێنــایتی بــۆ جــاری دووەم
بــۆ لای بــاپیری بــە ســەخــا و کــەرەم
لــە عـومری شــەش دا لــەگــەڵ (والــدە)
چـووی بـۆ مـەدینـە لای جـەدد و جـەددە
کــە گــەڕانــەوە لــە خــاکی ئــەبــوا
دایکیـشت سـەرکـەوت بـۆ دەرگـای خـودا
لــەگــەڵ جاریــەی بــێگــەرد و لــەکــە
زوو هاتیتــەوە بــۆ شــاری مــەککــە
لــە نــاو بــارەگــای بــاپیری خۆشــحاڵ
هـەروا مایتـەوە تـا عـومری هـەشـت سـاڵ
لــە عــومری هــەشــتا باپیرشــت مــرد
بــۆ (أبوطالــب) وەســییەتی کــرد
بــە گیــان و بــە دڵ خزمــەتــت بکــا
نــەکــا زەحمــەتــێ بــە دڵــت بگــا
ئـەتـۆیش خۆبـەخـۆ بـە تـەربیـەتی حـەق
بــووی بــە خــاوەنی ئــەدەبی موتــڵەق

ئەونەی دارا بووی بۆ تەمێ و تەمکین
شۆرەتت دەرچوو بە ناوی ئەمین
چون لەبۆ سپی ڕەش نابێ بە بەش
نەبووی بە (کاتب) لەبۆ خەتی ڕەش
بێخوێندەواری بووی بە عەللامە
بووی بە ئوستادی خاوەن کەرامە
لای (أبوطالب) مامەکەی شەفیق
مایتەوە لە سەر مەقامی تەوفیق
لەگەڵ مامت چووی بۆ سەفەری شام
کە گەیشتیتە (بوسرا)ی خۆش‌مەقام
لەویا ڕاهیبێک بینیتی لە دوور
لە ڕاسەڕتەوە هەورێ وەکوو نوور
بە وێنەی چەتری ڕاگیراو لە سەر
تا هەتاو نەدا لە سەری ئەنوەر
ڕاهیب تێگەیشت بەم شانیشانە
کە پێغەمبەری ئاخر زەمانە
هاتە لای مامت فەرمووی بێ‌لەکە
بیگێڕەرەوە بۆ شاری مەککە
ئەترسم کە جووی حەقیقەت‌نەناس
لە شام بیکوژن بەبێ دەنگ و باس
مامیش (فوراً) تۆی گەڕانەوە
لە سەر ئەو شێوە و ئەو نیشانەوە
جارێکیش لەگەڵ (زبیر)ی مامت
چووی بۆ یەمەنی عالی مەقامت

جـا لـە سـەر کـەسـب و تیجـارەی دونیـا
بـووی بـە وەکیلـی خـەدیجـەی عولیـا
کچـی ئـەسـەدی بـە قـەدر و عیـززەت
خـاوەن شـەرەف و مـەقـام و شـۆرەت
کـە عـومرت گـەیـشت بـە ٢٥ سـاڵ
خـەدیجـەت هێنـا بـە قـەدر و کـەمـاڵ
تـۆ لـە ٢٥ ئـەو بـە ٤٠ ساڵـی
گـەیـشتن بـە یـەک بـە شـیرین‌حاڵـی
بـە هاونیـازی بـە خۆشـی ئـەحـواڵ
گـەلـێ پـەیـدا بـوون لـە مـاڵ و منـداڵ
(زینـب)، (فاطمـه)، (رقیـه)ی حوسـنا
(امکلثـوم)ی پـاکتر لـە مینـا
(قاسـم)، (عبـدالله)، ئـەمانـە هـەمـوو
لـە خـەدیجـە بـوون بزانـە فـەرمـوو
کاتـێ تـەعمـیری کـەعبـە هاتـە جـێ
(حجـر الاسـود) تـۆ داتنـا لـە جـێ
لـە عـومری ٣٧ بـە فـەیـزی قودسـی
خـاوێن بوویتـەوە لـە بـارەی نـەفـسی
هـەر سالـێ مانگـێ ئـەچوویتـە نـاو غـار
ئـەشـکەوتی حـیرا سـەراسـەر ئـەنـوار
بـەنـدەییـت ئـەکـرد بـۆ زاتی خـودا
بـە تـەفکـیری دڵ بـێ‌دەنـگ و سـەدا
دڵـت لـە تـەسـدیق لـە نـووری ئیمـان
پـڕ بـوو بـە خـودای سـەراسـەر جیهـان

بەم نـەوعـە فیکـرە پـڕ بـووی لـە ئـەنـوار
پڕ بووی لە جەوهەر پـڕ بـووی لـە ئـەسـرار

لـە سالـی چـڵدا جامـت هاتـە سـەر[1]
نـازڵ بـوو بـۆ لات جیبریلـی ئـەنـوەر
بـە ئـەمـری خـالیق بـووی بـە پێغـەمبـەر
لەبـۆ (جن) و (انـس) تـۆ بـووی بـە ڕەهبـەر
فـەرمـووی بخوێنـە گـەورەی سـەردارم
فـەرمـووت نـازانم نـەخوێنـدەوارم
جیبریـل تـۆی گووشـی بـە سـینەی خـۆدا
بـۆ ئیلقـای ئـەنـوار بـە دڵـی تـۆدا
ئەم ئەمر و نـەفیـە تـەکـرار بـوو سـێ جـار
لـەگـەڵ جیـبرەئیـل فریـشتەی سـەردار
پـاش (بـسم الله الـرحمن الـرحیم)
ئـەو جـوبرەئیلـەی بـە قـەدر و تـەکـریم
زوو (اقـرأ باسـم ربـک)ەی فـەرمـوو
هـەتـا پێـنج ئایـەت یـەکـەم دەرزی بـوو
مـەعنـای وەهـابوو کـە خـودای عالـەم
خوێنـدنی ئـەوێ بـۆ بـەنی ئـادەم
تـا بـەشـەر ببـێ بـە خـاوەن قـەڵـەم
ببـێ بـە دارا بـۆ عـیلم و عـەلـەم
عـیلم بـە سـوودە لـەبـۆ خـاس و عـام
عـیلم ئـەساسـە بـۆ دیـنی ئیـسلام

١. جامت هاتە سەر، یان پیالەت پڕ بوو واتە: پێگەیشتی.

عیلمیش وا لە لای زانای بە هیممەت
کە سەرفی بکا بۆ خێری ئوممەت
جا ئەی ناخواندە عەللامەی عالەم
ئەی تاجی شەرەف بۆ بەنیئادەم
ئەی هاوڕازەکەی جیبریلی ئەمین
خۆشەویستەکەی (رب العالمین)
تۆی کرد بە ڕەهبەر بە قەدر و تەمکین
تۆی نارد بە ڕەحمەت لەبۆ عالەمین
تۆ ئەو ئەنوارە وا لە ناو دڵتا
تۆ ئەو ئەسرارە وا لە حاسڵتا
لا بکەرەوە بۆ چارەی (نامی)
بۆ بەختیاری لە ڕێی ئیسلامی
غولامت زۆرن لە گەورە مەردان
(نامی)ش یەکێکە لە گەلی کوردان

### سەرەتای پێغەمبەری

پاش لیقای زاتی پاکی جوبرەئیل
پاش وەرگرتنی ئایاتی تەنزیل
تۆ هاتیتەوە بە قوودوومی خەیر
بۆ لای خەدیجەی خۆش‌سولووک و سەیر
بۆت گێڕایەوە وەزعی ڕابووردوو
ئەویش عەرزی کرد ئەی زاتی خۆش‌خوو
تۆ دڵنیا بە کە دۆستی خودای
لەبۆ ڕووی جیهان یەکەمین چرای

خـــاوەن ڕەوشــتی و خـــاوەن کــەرامــەت
دڵـــــسۆزی لــــەبـــۆ ئــــەفـــرادی ئوممــــــەت
بـــۆ میوانـــداری و خزمـــەتی غـــەریـــب
بـــــۆ دەرمــــانی دڵ بــــە وێنـــــەی تــــەبیـــب
مــەردی وەکــوو تــۆ، ســەربــەرزی ژینــە
ڕێنومــــــای دونیـــــا و ڕێنومـــــای دینــــــە
لــــەبـــۆ متمانـــە خـــەدیجـــەی زانـــا
بـــــــردیتی بــــــۆ لای وەرەقـــــــەی دانـــــا
ئـەویـش کـەسـێ بـوو زانـا بـوو بـە دیـن
زانـــا بـــوو بـــە ڕێـــی ئـــەدەب و تـــەمکــــین
بـــۆت گێڕایـــەوە بـــەســـەرهـــاتی غـــار
ئـــەویـــش عـــەرزی کـــرد بـــرازای نـــازدار
ئـەو کـەسـەی کـەوا هاتـە لات بـۆ غـار
فریــــشتەیـــەکــــە ئــــەمــــینی ئــــەســـرار
مــەشــهووره بــەڕێــز نــاوی جــوبرەئیــل
ئـــەمـــینی وەحیـــە و مـــەئمـــووری تـــەنزیـــل
هــەر ئـەو کـەسـەیـە نـازڵ بـوو بـە حـەق
بـــۆ عیـــسا و مووســـا و ڕەهبـــەران موتـــڵەق
تـــۆیش پێغـــەمبـــەری و ڕەهبـــەر خـــودا
ئـــاخ جـــوان ئـــەبـــووم بـــە دەنـــگ و ســـەدا
کاتـــێ خزمانـــت دوژمنیـــت ئـــەکـــەن
لـــە شـــاری مـــەککـــە ئـــەتـــۆ دوور ئـــەخـــەن
بـە شـەرتی ئینـسان، بـە خـۆش‌سیرەتی
ئامـــادەم ئـــەبـــووم لــــەبـــۆ یارمــــەتی

جا حەزرەت فەرمووی قەومی من وەها
ئەبن بە مایەی مەینەت و غەوغا
پێی فەرمووبەڵێ یاسای ژیانە
حەسوود دوژمنی چەرخی جیهانە
بەم قسە و باسەش دڵی دامەزرا
ئەگرا بە سۆز بە وێنەی چرا ...
هەتا جارێتر هاتەوە جیبریل
ئەمینی وەحی و مەئمووری تەنزیل
ئەی پێغەمبەری بە هیممەت ئەعلا
خۆشەویستەکەی خودای تەعالا
ئەی فورستادەی بەرزی موعتەبەر
بەشیر و نەزیر بۆ (جن) و بەشەر
لە لای خوداوە ئەمرت هێناوە
پەخشت کردەوە بە ڕووی دونیاوە
فەرمووتە بەهەشت بۆ ئیماندارە
بۆ موسوڵمانی شیرین کرداره
فەرمووتە دۆزەخ بۆ بێئیمانە
لەبۆ نامەردی نامیهرەبانە
لە غاری حیرا کە هاتیتە خوار
لە پاش ماوەیەک جیبریلی نازدار
هێنای بۆت سوورەی بەرزی (مدثر)
ئەمری بۆ هێنای بە (قم فأنذر)
ئەتۆیش بە کەرەم بە وێنەی چرا
بووی بە ڕووناکی بێگانە و برا

بـە حـەق گـەیانـدت فـەرمـوودەی خـودا
بـــە ڕۆژ و بـــە شـــەو مـــەگـــەر لـــە خـــەودا
یـەکـەم ئینـسانێک هاتـە سـەر تـەسـدیق
(ابـــوبکر) بـــوو کـــە بـــوو بـــە (صـــدیق)
یـــەکـــەم منداڵـــی ناباڵـــغ بـــە ســـاڵ
عــەلی بـــوو ئـــەویـــش گـــەلـــێ بـــە کـــەمـــاڵ
یـــەکـــەم ژنێکـــیش ئیمـــانی هێنـــا
خـــەدیجـــەی بـــێ‌گـــەرد دڵ وەکـــوو مینـــا
پـــاش ئـــەوان یـــاران بـــە زیـــاد و کـــەم
ئیمانیـــان هێنـــا بـــە دیـــنی ئـــەکـــرەم
ئایـــەتی قورئـــان بـــۆت ئـــەهاتـــە خـــوار
شـــەوقـــی دایـــەوە مـــەککـــە بـــە ئـــەنـــوار
جـــا کـــافرەکـــان بـــە زۆری حـــەســـەد
کـــەوتنـــە ئـــازار دان بـــە دڵ بـــە جـــەســـەد
بـــە ئـــازار دانی یـــارەکـــانی تـــۆ
بێـــزار کـــردنی دڵـــدارانی تـــۆ
ئەتۆیش ملکـەچ بـووی بـۆ قـەزای خـودا
بـــۆ نـــەشـــری ئیـــسلام بـــۆ ڕێگـــەی هـــودا
لـــە تـــاو ئـــازاری کـــافری پڕغـــەش
یـــاران کۆچیـــان کـــرد چـــوون لـــەبـــۆ حـــەبـــەش
بـە پـەنجـەی پێنجـەی تـەبیعـەت دێـوان
کۆچیـــان پـــێ‌کـــردن بـــۆ کـــەژ و کێـــوان
دوور خرانـــەوە لـــە کـــەعبـــەی ئـــەعـــزەم
لـــە مولتـــەزەم و لـــە بـــیری زەمـــزەم

دەرچوون لـە مـەککـەی عـالی مـەراتیـب
بـــۆ (شـــعب)ی مـــەنـــسووب بـــە (أبوطالــــب)
بـە قــەهــری خــودا ئــەو بـەدکارانــە
بــــوون بــــە عیــــبرەتی چــــەرخــــی زەمانــــە
دیـسان بـە پـەنجـەی پێنجـی بـەوەفـا
هاتنــــەوە مــــەککــــە لای مــــەروە و ســــەفــــا
تـــۆ هـــەر ســـەرکـــەوتی بـــەرەو ئاسمـــان
دوژمـــن دانـــەویـــن لـــە چـــەرخـــی زەمـــان
جـا ئـەی شـامەردی خـۆگر بـە قـەزا
بــــــۆ ســــــزای ڕێگــــــەی ئیــــــسلامی ڕەزا
بڕوانـــە بـــۆ دڵ بـــە لـــوتفی ســـامی
بـــەڵـــکوو ڕزگـــار بـــێ لـــە خـــامی (نـــامی)
ئـەی پێغـەمبـەری خـۆگر لـە ڕەنجـا
تـــالیبی خـــودا لـــە ســـەیلـــی گـــەنجـــا
لـە پـاش وەفـاتی مـامی بـەڕێـزت
کـــۆچی دوایـــی ئـــەهلـــی عـــەزیـــزت
بـــۆ دڵ دانـــەوەت لـــە ئـــازاری دڵ
بـــۆ حـــەســـانەوەت لـــە بـــاری موشـــکڵ
لـەبـۆ تـەشـریفت لای پـەروەردگـار
ئـــیعلانی بـــەرزیـــت لای یـــار و ئـــەغیـــار
لـە بیـست و حـەوتی مـانگی ڕەجـەبـدا
لـــە دەوری کـــەعبـــەی خـــاوەن حـــەســـەبـــدا
لـە پـەنجـا و یـەکـی عـومری شـەریفـت
لـــەبـــۆ تـــەلتیفـــی دڵـــی لـــەتیفـــت

جیبریل هاتە خوار بە چەند لەتافەت
بە چەند ئیعزاز بە چەند شەرافەت
بە چەند ئیکرام و بە چەن تەهانی
لە ماڵی پوورت لای (أم هانی)
پێی تەبلیغ کردی سەلامی خودا
فەرمووی ئەی چرای ڕێگەی ئیهتیدا
بە ئەمری خودا مورادی خودای
دەعوەت کراوی بەرزی بارەگای
بوراق حازرە وا لە حوزوورە
دونیا موشتاقی ڕووناکی نوورە
هەتا ئافاقی (بین القبلتین)
تۆزی خاکی پێت بێنێتە سەر عەین
بەڵکوو بتبینێ (بیت المقدس)
نووریێ وەربگرێ لە ڕووی موقەددەس
قیبلەی ئەنبیا مونەووەر بێ پێت
بە دڵ ببێتە خاکساری ڕێت
وەربگرێ لە بۆی قودوومت عەترێ
بحەسێتەوە بە لیقای عەسرێ
جا هەستا لە جێ لای (أم هانی)
بە فەیزی ڕەحمەت قودوومی هانی
سواری (بوراق) بوو زاتی موقەددەس
هەتا گەیشتە (بیت المقدس)
ئەرواحی پاکان بە ئیستیقباڵت
گەیشتن بە سای نووری کەماڵت

گــەلی ڕەهبــەران حــازر بــوون لــە لات
بــــۆ وەرگـــــرتنی بـــەهــــرەی کـــەرامــــات
بــووی بــە پێــشەوای ئــەنبیــای کــیرام
بــۆ دوو ڕکــات نــوێژ تــۆ بــووی بــە ئیمـــام
پــاش ئــەمــە لــەویــا بــە فــەیــزی خــودا
بــــەرەو ســــەمــــاوات کـــەوتیتــــە هـــــەوا
چــون فریــشتەکــان لــەبــۆ تــۆزی پێــت
ئامــــادە بووبــــوون لـــە ســــەر جـــادەی ڕێـــت
نووری تۆی ئــەویــست مــەوجــاتی ئــەسیر
لـــــەبــــۆ زیــــادی تــــەنــــویر و تــــەئــــسیر
تــا لــە فــەزادا گــەردێ نــەمێنــێ
لای فریـــــشتەکـــــان دەردێ نــــــەمێنـــــێ
(عرجـــت مـــن المـــسجد الاقـــصی)
فریــــشتەی فــــەلــــەک بــــە زەوق ئــــەڕەقـــسا
سواری بوراق بــووی بــەرەو ڕووی فــەلــەک
بــــۆ ئیــــستیقبالت حـــازر بـــوون مـــەلــــەک
ئاسمانــەکــان هــەمــوو بــە تــەرتیــب
شــــەرەفیــــان وەرگـــرت لــــە لیقــــای حــــەبیـــب
هــــەر ئاسمانــــێ دەرگــــای ئــــەکـــراوە
لــــەم ڕەهبــــەرانــــە یــــەکـــێ بـــــە لاوە
مەرحەبــای ئــەکــرد بــە شــادی و ســوروور
موشـــەڕڕەف ئـــەبـــوو بـــە چـــڵچـــرای نـــوور
جــا بــۆ تــەشــریفت بــە قــەدر و بــەهــا
ڕابــــووردی بــــە ســــەر ســــیدرەی مونتــــەهـــا

هـــەتـــا قودوومـــت بـبـــێ لـــە نـــاوا
مونـــــەووەر بـبـــــێ (جنـــــە المـــــأوى)
بـۆ زومـرەی مـەلـەک بـە ئیفـادەی نـوور
بـــڕوانی بـــە چـــاو بـــۆ (بیـــت المعمـــور)
بـەو چـاوەی پـڕە لـە نـووری ئـەنـوەر
خـــاوەنی پایـــەی (مـــا زاغ البـــصر)
لـــەویـا فریـــشتەی خـــالیقی ئـــەکبـــەر
گـــەیـــشتنە خدمـــەت حـــەزرەتی بـــەشـــەر
لـــەوێ بـــەرەوژوور بـــە قـــەدر و شـــەرەف
ســـەرکـــەوتی لـــە ســـەر میعراجـــی ڕەفـــڕەف
لە کوورەی کورسی لە موعـەلـلای عـەرش
ڕابـــووردی بـــۆ تـــۆ بـــوون بـــە تـــەخـــتی فـــەرش
دەرچـووی ئـەی شـاباز بـە (خـرق العـاده)
بـــۆ ئـــەوجـــی بـــورجی ســـەفـــا و ســـەعـــاده
هـەتـا مـەقـامی فـەوقـی عـیلم و عـەیـن
کـــە تـــەقـــدیر کـــرا بـــە (قـــاب قوســـین)
عـەرش بـۆ تـەخـت و لامـەکـان بـۆ تـاج
بـــەســـە بـــۆ بـــەرزی مـــەرتـــەبـــەی میعـــراج
بە حەق نایـل بـووی بـە فـەیـزی حـوزوور
یانـــێ بـــە دەریـــای (نـــور علـــی نـــور)
ئـەی خـاوەن سـەفـای بـە سـافی ڕەهبـەر
خـــودات چـــاو پـــێکـــەوت بـــە دوو چـــاوی ســـەر
بـە حـەق گـەیـشتی بـە جێـی موناجـات
بـــۆ خـــۆت بـــۆ ئوممـــەت لای (قاضـــی الحاجـــات)

ئیکرامەت گێڕا بە ئیکرامێ وا
دەستی نەداوە لەبۆ ماسیوا
بۆ خۆت و ئوممەت خودای کائینات
پێنج فەرزەی نوێژی پێدای بە خەلات
بۆ ئەهلی ئەدەب لە زومرەی ئیسلام
پێنج فەرزە کران بە میعراجی عام
یانی بە ئەدەب کاتێ نوێژ ئەکا
موسوڵمان ڕۆحی بە خودا ئەگا
هەر لەو شەوەدا بە (ویداعی) حەق
بوو بە شابازی پەروازی موتڵەق
وەکوو سەرکەوتی هاتیتەوە خوار
لەگەڵ خەلاتی بەهرەی بەختیار
ماوەی موعجیزەی مەشهووری ناوە
حەڵقەی دەرگاکەت هەر ئەلەراوە
کاتێ سبەینێ بە یاسای مینهاج
بەیانێکت دا بە (ئیسرا و میعراج)
موئمین ژیاوە بە شنۆی سەفا
کافران مردن بە شوومی جەفا
بووبەکری (صدیق) وا هاتە مەیدان
فەرمووی بە خودای زەوی و ئاسمان
ئەوەی بۆ زەوی واتەی ڕەوایە
بۆ ئاسمانیش بەڕاستی وایە
ئەرز و ئاسمان چییە لای خودا
لە وێنەی (کا)دان لە بەر هێزی با

ئـەوەی کائینـات بـەو هـەڵـئەسـووڕێ
بـۆ هـەر سـەعاتـێ وەزعـی ئـەگـۆڕێ
ئـەوەی جازیبـەی قـودرەتی وایـە
بـۆ (کـا)ی کائینـات هـۆی کـارەبایـە
هـەر لـە کاتێکـا سـەد هـەزاران کـەس
سـەهلـە بیانبـا بـۆ پایـەی ئـەقـدەس
یـارەکانیـشت بـە نـوورێکی نـۆ
ئیمانیـان هێنـا بـە میعراجـی تـۆ
بـڕوا بـۆ دۆزەخ، بـەدخـوو وەکـوو خـۆ
بـا بـاوەڕ نـەکـا بـە میعراجـی تـۆ
ئـەم پایـە بـەرزە، خـوا دای بـە تـۆ
مـوعجیزەیـەک بـوو، بـوو بـە مایـەی تـۆ
بـوو بـە دڵـداری لـەبـۆ زاتی تـۆ
بـوو بـە مـوعجیزەی مـوعجیزاتی تـۆ
بـوو بـە بورهانـێ کـە زاتـت پاکـە
ڕۆحـی تـۆ ڕۆحـی ئـەرز و ئـەفلاکـە
بـوو بـە دەلیلـێ بـۆ مووسـای زانـا
(انـی أنـا الله)ی پـێوت لـە سـینا
بـوو بـە حوججـەتێ بـۆ ڕەفعـی عیـسا
لـە دەس جوولـەکـەی لـە خـوا نـەترسـا
بـوو بـە ئیـستیدلال کـە خـوای قـادر
لـە هـەمـوو شـوێنێ حـازرە و نـازر
ڕەحمـەت لـە ڕۆحـی پـاکی مـەولـەوی
بـڕژێ بـە سـەریـا نـووری مـەعنـەوی

«کـه (ذره)ی شـوعوور هـەیـه پێتـەوه»
«کـــه وتیـــان خـــودا ئـــەبڕێتـــەوه»
لـه لای ئـەو کـەسـەی خـاوەن فوتووحـه
میعـــراج و ئیـــسرا بـــه جیـــسم و ڕۆحـــه
قیمـەتی چییـه بـه خـەو بـه خـەیـاڵ
هـەمـوو کـەس ئـەڕوا بـۆ ئـەوجـی کـەمـاڵ
بـــا (ابوجهـــل) بمـــرێ لـــه غـــەمـــا
ئـەو مـا لـه دەمـا تـۆ چـووی بـۆ سـەمـا
بـۆ تـۆ مـوعجیزەی میعراجـت ڕێ کـەوت
ئـــەویـــش لـــه بـــیری بـــەدردا داکـــەوت
بـه قوربانـت بم ئـەی شـای بـه شـەرەف
ئـــەی تـــاوی هـــەتـــاو بـــۆ هـــەمـــوو تـــەرەف
تـۆ خـۆت مـوعجیزه و خولـقت مـوعجیزه
عالـــەم لـــه کـــەشـــفی کـــارت عـــاجزه
بیکـه بـه خـاتر بـەهـرەی خوداییـت
بیکـــه بـــه خـــاتر ڕێـــی ئاشـــناییت
سـەرگـەردان مـاوه (نـامی) لـه دونیـا
ئاشـــنای فـــەرمـــوو بـــه پایـــەی عولیـــا
بیکـه بـه بـەنـدەی بـارەگـای بـەرزت
بـــا دڵزینـــدوو بـــێ بـــۆ دەرکـــی دەرزت
پـێم بـڵێ بمـره لـه لای شـابازا
شـــاباڵ لـــێبـــده لـــه بـــای پـــەروازا
ئەی ڕەوحی ڕەحمەت ئەی تەیری قودسـی
ئـــەی لوقمانـــەکـــەی نـــەخۆشـــی نـــەفـــسی

تۆ چرای حەق بووی نەکوژایتەوە
رۆحی موتڵەق بووی نەپژایتەوە
تا دوژمن ویستی بتدا بە ئەرزا
تۆ هەر سەرکەوتی بە پایەی بەرزا
بووی بە فریشتەی سەر بورجی شەرەف
دوژمن هەزاران رۆین بە تەلەف
تا بەرزیت گەیشت بە میزانی وا
ون بووی لە چاوی دڵ خاوی هەوا
کە دەسیان بڕا لە هەموو لایە
بە هەموو حیلە و بە تەقالایە
بڕیاریکیان دا هەموو بە جارێ
شێوەت نەمێنێ لە هیچ دیارێ
کە خەبەردار بووی بە ئیلهامی حەق
لە شوومی کوفری کافری موتڵەق
زوو هەستای لەگەڵ بووبەکری نازدار
چوون موختەفی بوون لە چاوی کوففار
داتنا لە جێدا حەیدەری کەڕڕار
مناڵ بوو دوور بوو لە شەڕی کوففار
بە تەنها خۆت و (صدیق)ی نازدار
چوون بۆ غاری سەور جێی دووپشک و مار
دەستەی کافران کە هاتن بۆ ماڵ
جێگە خالی بوو لە شای پرکەماڵ
بڵاو بوونەوە بە هەموو لادا
ئەگەڕان بە دوای شاهی مەولادا

نزیک بوونەوە، لە بەر دەرکی غار
ترسا بووبەکر لە شەڕی کوففار
ئەتۆش پێت فەرموو بە لێو بە پەنا
(لا تحزن ان الله معنا)
خوا کۆترێکی ناردبووە ئەوێ
هێلکەی کردبوو چەند ڕۆژێ شەوێ
(جۆلایی کەرەش) لە دەرگادا بوو
هەندێ نەسیجی لەویا کردبوو
ئەمانەیان دی گەڕانەوە دوا
وتیان چی ئەکەن لەم ئەشکەوتەدا
ئەمەیش بەڕاستی عیبرەتە عیبرەت
بۆ پاراستنی (صدیق) و حەزرەت
پاش ئەمە دەرچوون بە ڕێی ساحیلدا
بە ڕێگەی ڕاستا نەک بە (مایل)دا
سوراقەش کە هات کەوتە دواتان
ڕۆچوو بە ئەرزا سێ جار لە لاتان
ئیمانی هێنا، موژدەیشی وەرگرت
گەڕاوە دەستی لە بۆیان نەبرد
سەرکەوتی و لات دا بە وێنەی ئەمیر
بۆ خەیمەی (ام معبد)ی فەقیر
مەڕە پیرەکەی بوو بە کانیی شیر
بۆ پیرەژنی بێهێز و تەئسیر
تا حەیاتی بوو لە ڕووی دونیادا
ئەو مەڕە پیرە هەر شیری پێدا

ئەمجارە دەرچوون بێ‌خەوف و خەتەر
بەرەو مەدینەی بە مایە و سەمەر
بۆ دڵدانەوەی گەلی نوجەبا
بووی بە میوانی قەومێ لە قوبا
هەفتەیەک لەویا مزگەوتێکت کرد
جومعەی یەکەمت تیا بەجێ هاورد
شاری مەدینەی بە عیزز و ئیقباڵ
بەجێیان هێنا یاسای ئیستیقباڵ
چوویتە ناو شاری مەدینەی مەحبووب
وشترەکەت نووست لای (أبو أيوب)
جا عالەم گەیشت بە دیداری تۆ
دیداری چارەی پڕئەنواری تۆ
بارانی ڕەحمەت باری لە سەرا
کە حەزرەت دانیشت لەو دەور و بەرا
دونیایەکی تر عالەمێکی پاک
ڕۆژێکی پیرۆز شەوێکی ڕووناک
بەڵێ ئاوایە چڵچرای پڕنوور
نووری خۆی ئەدا بە نزیک و دوور
جا ئەی پادشای مەشریق و مەغریب
خاوەن پێتەختی پیرۆزی (يثرب)
لە بەر قودوومی پاکی پیرۆزت
لە بەر ڕوسوومی دڵی بە سۆزت
بەو فەیزە خودا پێی‌دای بە تەمکین
کە بووی بە ڕەحمەت لەبۆ عالەمین

لا بکـــــەرەوە بـــــە لای (نـــــامی)دا
تـــا دەرچـــێ لـــە بـــۆی کـــۆی (ناکـــامی)دا
نیگـــای لاچـــاوێ کافییـــە لـــەبـــۆم
بـــەڵـــکوو بـــە ئیمـــان بـــژیم و بـــڕۆم

**دامەزرانی لە مەدینەی مونەووەرەدا**

ئـــەی ڕەهبـــەرەکـــەی ڕێبـــازی ئیـــسلام
ئەی ئـەنـوەرەکـەی مـەحبـووبی عـەللام
ئـــەی پایـــەبـــەرزی عالـــەم ســـەراســـەر
لای خـودا و بـەنـدە و ماسـیوا یـەکـسەر
بـە حـەق کۆچـت کـرد لـە ڕێـی خـودادا
خـوایش یارمـەتی دای لـە ڕووی دونیـادا
ئـەتـۆ سـەرکـەوتی لـە ئـەنـوای جـەووی
دوژمـن بـە پـەسـتی و پیـسی دانـەوی
کـە تـۆ سـەرکـەوتی هـەتـا (فـوق العـرش)
دوژمـن لـە بـەر پـێ بـوو بـە کۆنـەفـەرش
ئاسمـــان بـــەرزە و نابـــێ بـــە زەوی
بولـــەنـد بولـــەنـدە نابـێ بـە نـەوی
هـــەر کـــەســـێ خـــوا بـــەرزی کاتـــەوە
قـــەت دانانـــەوێ بـــە نـــەهاتـــەوە
چـرا هـەڵگیرسـێ بـە نـووری مـەقسـوود
ناکوژێتـەوە بـە هـەوای حـەسـوود
ئـــەو غونچـــە بـــەتـــاو بگـــەشـــێتەوە
تـــا هـــەتـــاو لێـــی‌دا ئـــەشـــنێتەوە

«ویـــــــــــأبی الله الا أن یـــــــــــتم»

خــەتمــی شــەرەفــە بــۆ نامــەی خاتــەم

ئــەمجــار دەس بکــە بــە بینــای مزگــەوت

لەبــۆ نــەشری دیــن بــە یاســای ڕێکــەوت

ئــەم بــەش و بــەهــرە بــەهــرەی خودایــە

تــــاجی عیــــزەتی (رســــول الله)یــــە

ئــەی ســەردارەکــەی خــاوەن مــەعریفــت

خاوەن بەهـرەکـەی ڕەحمـەت و ئولفـەت

بــــەختیـــارەکــــەی خــــاوەن ئیــــدارە

هــــەتــاو لــە تــۆوە خــاوەن ئــەنــوارە

ئـەی خـاوەن ڕەفتـار بـە یاسـای حیکمـەت

پایــە بــەرقــەرار بــە هێــز و هیمـمــەت

لــە پــاش دامــەزران لــە شــاری (یثــرب)

بووی بە ئـەنـواری مـەشریق و مـەغریـب

زوو عــەرســەت کــرِی بــە دارایــی خــۆت

بــوو بــە ســەدەقــەی جارییــە لــە بــۆت

(بــــسم الله) نــــاوی خــــودات بــــردەوە

مزگــــەوتی ڕەوزەی بـــەرزت کــــردەوە

کــــردت بــــە پایــــەی عیبــــادەتخانــــە

بــــۆ هــــەر ئینــــسانێ کــــە موسوڵــــمانە

کــردت بــە جێگــەی تــەربیــەتی عــام

لــــە ســــەر مینــــهاجی ئــــایینی ئیــــسلام

بـوو بـە مـەدرەسـە بـۆ عـیلم و حیکمـەت

بـۆ ڕەوشـتی بـەرز بـۆ هێـز و هیمـمـەت

هەتا شاگردێ لە کەس نەپرسێ
لە غەیری خودا لە کەس نەترسێ
تا فیدایی بن بۆ دینی ئیسلام
تا سەودایی بن بۆ خودای عەللام
تا سەرکەوتوو بن لە مایەی دەنی
خاوەن (حضارە)ی بەرزی مەدەنی
تا ئیمان بێنن بە عالەمی غەیب
دوور بن لە شوبهە و لە گومان و ڕەیب
تا شوعوور بکەن بە مەسئوولیەت
بەندەی خودا بن بە مەمنوونییەت
تا بە ڕۆحی پاک ببنە خەبەردار
ببن بە خاوەن بۆ دەرکی ئەسرار
تا لادەن لە بای ئارەزووی نەفسی
لەبۆ مەرحەبای بارەگای قودسی
تا لە ئەنجاما بە قەدر و هیممەت
نیشانە بکرێن بە «خیر أمە»
لە پاش ئیستیقرار یارانی ئەخیار
هیجرەتیان کرد و هاتن لەبۆ شار
«رضی الله عن السابقین
علی سبقهم ثم اللاحقین»
«والتابعين لهم باحسان»
کە چینی بەرزن، بۆ مەعنای ئینسان
ئەمری غەزا هات بۆ نەشری ئیسلام
بۆ چاری شەڕی کافران بە عام

مەبەس لەم غەزا تەمێ و تەعلیم بوو
بۆ ڕێنموونی سیدق و تەسلیم بوو
هەر شوێنێ بانگی ئیسلامی ئەبوو
غەزا و مەعرەکە لەوێدا نەبوو
هەر مەبەس نووری دڵی بەشەر بوو
ئیسباتی خاوەن سایە و سەمەر بوو
تا دوور ببنەوە لە خۆڵ و خاشاک
نزیک ببنەوە بە ئەخلاقی چاک
تا جیهان بکەن بە باغ و بێسان
تیایا بڕوێنن شەجەرەی ئیحسان
هەتا دەس کەوێ سەمەری تەسدیق
بە وێنەی بەهرەی بووبەکری (صدیق)
جا مونافیقان لە ناو مەدینە
کەوتنە سەرباری حەسەد و کینە
(مۆامرات)ی جوولەکەی بەدخوو
لەبۆ موسوڵمان بوو بە هۆی ئاشوو
شەڕیان نایەوە بۆ زمرەی ئەسحاب
عەرەبیان هەڵنا بۆ جەنگی ئەحزاب
هەروا کافران لە هەموو لاوە
دەمیان بردە لای شەڕ و غەوغاوە
تا غەزای بەدر و ئوحود و ئەحزاب
غەزای خەیبەریش ڕووی دا بۆ ئەسحاب
لەم ئاشووبانە موسوڵمان دەرچوو
بە هێزی ئیمان بە تەمیزی خوو

هاتــــە دی مایــــەی (بیعـــــە الرضــــوان)
(عمــــرەالقـــضا)ی گــــەلی پـــەیـــڕەوان
تــا بــە یــادی حــەق لــە سالــی هــەشــتا
لەگەڵ هەشت هـەزار ئـەهلـی بـەهـەشـتا
بـە جوانمــەردی فــەتحــی مــەککــەت کــرد
بــتی بــەدچــارەت لــە کــەعبــە لابــرد
دلـــت بـــۆ ڕەحمـــەت وابـــوو بـــە زامـــن
فـــەرامۆشـــت کـــرد دوژمنیـــی دوژمـــن
عـــەفـــوی عامـــت دا ئـــەی شـیری لیقـــا
فـــەرمــــووت (اذهبــــوا أنـــتم طلقــــاء)
بـۆ دۆسـت و دوژمـن ڕەحمـت هاتـە جـۆش
دوژمن وەکـوو دۆسـت دڵـشاد و دڵـخۆش
پاش فـەتحـی مـەککـە غـەزاکـەی (حـنین)
هاتـــە ڕوو لـــەبـــۆ (ســـید الکـــونین)
لــە ئــەووەڵ کــارا کــەوتنــە هــەزیمــەت
شــکا شمــشێری عــەزم و عــەزیمــەت
لـەو کاتـا دەرکـەوت بـۆ تـۆ شـەجاعـەت
لـەگـەڵ تـەنیـایی بـە هێـز و هیممـەت
ئـــەتفـــەرمـــوو (انـــا النبـــی لا کـــذب)
هـــــەروا «أنــــا ابـــــن عبـــــدالمطلب»
تـــا فریـــشتەی حـــەق هـــاتن بـــۆ یـــاری
بـــوون بـــە وەســـیلە لـــەبـــۆ ڕزگـــاری
ســـوپای هـــەوازیـــن شـــکا بـــە یـــەکجـــار
لـە سـەر تـەوفیقـی خـوای پـەروەردگـار

لەو حەربا شەیماء خوشکی هاوشیرە
هات لەبۆ تکا بە حوسنی سیرە
هات لەبۆ تکای تالانی هەموو
تۆش پێتدایەوە ئەوەی کە مابوو
دەستت نایە ماڵ بۆ ئەم و بۆ ئەو
وێنەی هەتاوی پڕنوور و پڕتەو
پاشان غەزا بوو غەزاکەی تەبووک
دوژمن هەلاتن وەکوو پووشی سووک
(نصرت بالرعب) نەجمەی شانت بوو
پادشای بەندەی بێ‌نیشانت بوو
بۆیە وا عالەم کەوتە بەردەستت
هەزاران هەدەف کەوتە بەر شەستت
خوا نەسرەتی دای بە نەسرەتی وا
ڕووی نەدا لەبۆ گرۆی ئەنبیا
دوژمنەکانت بوون بە خەوش و خاڵ
دۆستت گەیشتە بارەگای کەماڵ
(بنی قریظە)ی بەری لە سەواب
بوون بە هۆ لەبۆ هێرشی ئەحزاب
خودا بە بایە ئەوانی دەرکرد
(بنی قریظە)ی بە سووکی لابرد
یەهوودی خەیبەر سەریان هێنا دەر
حەزرەتیش فەرمووی (خربت خیبر)
وەها بە یاسای خوای پەروەردگار
بەدکار ئەفەوتێ لە ڕووی ڕۆژگار

ڕۆحــــی ئیــــسلامی بــــێتــــۆز و گــــەردە
مــــەردی خــــاوەن ڕۆح دەرمــــانی دەردە
دڵــــێ ئیمــــانی تیــــا هــــەڵبگیرســــێ
چلـۆن لـە ڕێـوی و چـەقـەڵ ئـەترسـێ
شــێری شــەرزە بــێ لای ئــەو ڕێوییــە
درنــدەی وەحــشی لای ئـەو هــیچ نییــە
فــەرقــی مابــەیــنی ئینــسان و حــەیــوان
ئـەو ڕووی لـە ماڵـە ئـەم ڕووی لـە کێـوان
ڕۆحــــی ئینــــسانی بــــەرزە و لایقــــە
ڕۆحێکــــی زانــــا بــــە حــــەقایقــــە
مــەردی خــاوەن ڕۆح بــە یــاری خــودا
ئــەڕواتــە عــەرش و دێتــۆ لــە ســەردا
حــەیــوانی بــێهــۆش وا لــە لــەوەڕدا
چ لــە دەشــتا بــێ و چ لــە گــەوڕدا
مــەردی مــەعنــەوی بــێخــۆف و خــەتــەر
ئــەبــێ بــە خــاوەن بـۆ فــەتــح و زەفــەر
دەنگــی هــەیبــەتــت ئــەی شــای ئــەنبیــا
مانگــە ڕێگــەیــەک ئــەچــوو بــۆ دونیــا
دوژمــن ئــەوەنــدە لــە تــۆ ئــەترســان
بــێ پــەت نانــە مــل بــۆ خــۆ ئــەتاســان
مــەعلوومــە ڕۆمــی ســوپایان جــەم کــرد
ســنووری شــامیان بــە ســوپا داگــرت
ســوپای ئیــسلامیش بــە نــەفــیری عــام
ڕۆیــی بــەرەو ڕووی کوففــاری نــەفــام

تـا سـوپای ئیـسلام گـەیـشتە تـەبووک
ئـەوان هـەلاتـن بـە شـێوەی مـەهتـووک
بـەدر و ئوحـود و خـەیبـەر و حونـەیـن
زۆریـان تیـا ڕژا خـوێنی تـەرەفـەیـن
لـەو حـەربانـەیـشا هـەر سـوپای ئیـسلام
خـاوەن زەفـەر بـوون بـۆ کـاتی ئـەنجام
بـەڵـێ لـە جـەنگـی کێـوی ئوحـودا
شکـستی لـەبـۆ موسوڵـمان ڕووی دا
لـە سـەر ئـەوە بـوو کـەوتنـە خـەتـەر
دەرچوون لە یاسـا و فـەرمـوودەی ڕەهبـەر
ئـەگـەرنـا سـوپای ئیـسلامی سـەربـەرز
بـە ڕۆح غالـبە لـە هـەمـوو سـەر عـەرز
(روح القـدس) بـوو بـۆ کـوڕی مـەریـەم
بۆ (ئیحیای) مـردووی بـەبـێ زیـاد و کـەم
کـە (روح القـدس) سـەر بێنێتـە دەر
مووسـایش حـازرە بـۆ ئیحیـای بـەشـەر
دەس بێتـە چـرا، عاسـا بێتـە مـار
زینـدوویش ئـەبێتـوو مـردووی خاکـسار
سـا ئـەی مـەرهـەمـی دڵـی بیمـاران
خـاوەن کـەرەمـی چـارەی غـەمبـاران
ئـەی سـەرحـەڵقەکـەی دەورەی ئـەنبیـا
ئـەی سـەرفیرقـەکـەی سـوپای ئـەسفیا
تـەی ناکـا دەریـای وەسـفت بـە تـەوسـیف
(نـاظم) یـا (نـاثر) لـە زانـای شـەریـف

شـەرحـی پـێنـەکـرا عالـەمـی تـەکلیـف
ئـەسـراری زاتی بـە مایـە و تـەشـریف
ئـەوەنـدە دەرکـەوت کـە عـەبـدی خـودای
ئـەنـا تـۆ غـەیـری هـەمـوو ماسـیوای
دونیـا کـەمێکـە لـە سـەخـای زاتـت
دەریـا نمێکـە لـە کـەراماتـت
منـیش کـەمتـرین خزمـەتـاری تـۆم
دامـاوی دەرگـای بـێڕەنـگ و بـێبـۆم
گـەلـێ موحتـاجم بـە ئیلتیفاتـێ
دامـاوم لـەبـۆ بـەهـرە و خـەڵاتـێ
نیگـای چاوێکـت بـەسـە بـۆ (نـامی)
تـا بمـرێ لـە سـەر ڕێگـای ئیـسلامی

## باسی قورئانی پیرۆز

ئـەی خـاوەن مایـە لـە پایـەی تـەعلـیم
مـوراد و مـەحبـووب بـۆ خـودای عـەلـیم
ئوسـتادی گـەورەی جامیعـەی تـەنـزیم
(انـــک لعلـــی خلـــق عظـــیم)
ئیمـان و وەفـا بـە عـەهـد و پـەیمـان
عیلم و حـیلم و سـەبـر ئیحـسان و ئـەمـان
ڕەحـم و دلـسۆزی ئـەدەب و حـەیـا
بـە تـۆ پـەرەی بـەسـت گـەیـشتە دونیـا
ئـەرز و ئاسمـان تـا سـەربـانی عـەرش
وان لـە بـەر پێتـا بـە وێنـەی سـەر فـەرش

عەرشە سەر ئەکا بۆ تۆ بە سوپەر
مەمنوونە کە تۆ پێی بنێیتە سەر
لە لای قەدری تۆ بێنرخە دونیا
ئەو نمێ ئاوە و تۆ مەوجی دەریا
تۆ بووی سوارەکەی سەر پشتی بوراق
بۆ (بیتالمقدس) بۆ سەیری ئافاق
عووروجت فەرموو بە هێزی خەللاق
سەر کەوتیتە سەر بۆ (سبع الطباق)
لەبۆ تەشریفی خەلایق یەکسەر
لە فەلەک دەرچووی لە فەزا بەدەر
تۆ بووی بە مەجمەع بۆ نووری تەنزیل
بوو بە سەفیرت حەزرەتی جیبریل
بۆ تۆ هاتە خوار ئایاتی قورئان
بووی بە عەمیدی جامیعەی جیهان
قورئان هاتە خوار بە ئەمری خودا
بانگ ئەکا لەبۆ «جنەالمأوی»
موعجیزەیە بوو بە دەنگ و نەوا
بەرامبەری کرد لەگەڵ ماسیوا
لەگەڵ عالەمدا لە جن و بەشەر
لەگەڵ ئەهلی دەرک بە عیلم و خەبەر
چ لەبۆ هەمووی چ بۆ دە سووورە
چ بۆ سوورەتی کورتی مەقسوورە
کەس بۆی ڕێنەکەوت کە بێتە مەیدان
ئەوسا تا ئیستە و تا ئاخر زەمان

چون ئوسلووبەکەی ئوسلووبی غەیبە
بە هەموو بارا بێنەقس و عەیبە
لە وتاری کەس ناچێ بە سوورەت
بەرزە لە پایەی ئەهلی بەسیرەت
بۆ دڵی عاقڵ خاوەن ئەنوارە
بۆ دڵی کامڵ خاوەن ئەسرارە
حەقیقەتەکەی بەرزە بە عولووم
بە لەفز و مەعنای (منطوق) و (مفهوم)
ئەگێڕێتەوە باسی مەغیبات
لە (سر)ی ئیجاد لەبۆ کائنات
ئەگێڕێتەوە باسی ئەنبیا
سەبر و تاقەتیان لەگەڵ ئەشقیا
دەرئەخا بۆمان وەزعی ئاسمان
هاتوچۆی کەوکەب بە تووڵی زەمان
ئەسراری مادە و تەبیعەت هەموو
بە شێوەی ڕاستی بەبێ یەکودوو
ئەوەی کە قورئان وا لە ناو دڵیا
عولوومی عالەم وا لە مەنزڵیا
شیفای نەخۆشە (باطن) و (ظاهر)
بە سەر دوژمندا غالیبە و قاهیر
پڕە لە سیرڕی بەلاغەی کەلام
لە نوکاتی ورد بۆ خاوەن ئیفهام
پڕە لە نوکتە و حیکمەت و ئەمسال
لە سەر یاسای حەق بێوێنە و میسال

دووره لــه درۆ و لــه شــێوەی جوهھــال
لــه موبالــەغــەی مووجیــب بــۆ مــەلال
دەرمــــــانی دەردە بــــــۆ دەردەداران
لوقمــــانی فــــەردە بــــۆ دڵ بیمــــاران
قــووتی ئــەرواحــە بــۆ دڵــی زینــدوو
شــەربــەتی ڕاحــە بــۆ ســینەی تینــوو
پــڕە لــه وەعــز و تــەنــویر و ئیرشــاد
لــه زیکــر و فیکــر و تــەسـبیح و ئــەوراد
پــڕه لــه یاســا بــۆ ئــەحکــامی دیــن
لــه ئــەســڵ و فــەرعــا ئوســتادی یــەقــین
ســەد جــار بیخــوێنی یــاخود ببیبیــەی
بــه وێنــەی واتــەی تــازەی تــێئــەگــەی
نــووری وای هــەیــە بــۆ دڵ و دەروون
دڵ وەریئــەگــرێ بــه شــێوەی مــەمنــوون
بــەهــرەی پــیرۆزە، بــۆ پــەری و ئــادەم
بـۆ ئــەهلــی ئینــساف لــه کــوورەی عالــەم
هــەروا مــەحفــووزە و ئــەمێنێتــەوە
هــەتــاکوو دونیــا ســەر ئــەنێتــەوە
ســەفایــە بــۆ دڵ، نــووره بــۆ بــەســەر
عــەدلــه بــۆ حــاکم تاجــه لــه بــۆ ســەر
شــەجــەرەی تــەیبــەی بــاغی خودایــە
باغــەوانــەکــەی حیفــزی خودایــە
من یا غــەیری مــن بــه کــەمی ئیــدراک
چۆن بکــەیــن ســەنــای هــەتــاوی ئــەفــلاک

نـووره کــارەبــای گــەرمــا و ســەرمایــە
هــەتــاوی بــورجی بــەرزی ســەمایــە
مایــــەی نیزامـــــی پـــڕ ئاسایـــشە
وەکـــوو ڕۆژی بـــەرز بـــە نومایـــشە
لـەفـزی بـۆ عـەوام مـەعنـای بـۆ عالـەم
درایـــە دەســـتی ڕەســـوولی خاتـــەم
(نـــصر مـــن الله) بـــۆ قوببـــەی تاجـــت
(فـــتح قریـــب) بـــوو بـــە خـــەراجـــت
بـۆ بـەهـای بـەرزیـت بـە سـەر عالـەمـا
بـــۆ عـــیلم و دەرزت لـــە نـــاو عالـــەمـــا
ڕەحمێکی گشتی ئـەی شـای بـەهـەشتی
بفـــەرمـــوو بۆمـــان ببـــێ بـــە کـــەشـــتی
مـــەوجـــی دەریایـــە ئـــەم ڕووی دونیایـــە
کـــەشـــتییەوانـــەکـــەی (رســـول الله)یـــە
لـــوتفێکیش بکـــە بـــە حالـــی (نـــامی)
ببـــێ بـــە زانـــای دیـــنی ئیـــسلامی
ئەی سـەرچـاوەکـەی کـەرامـە و ئیحـسان
بـۆ ئیـنس و جـن و فریـشتە یـەکـسان
ئـەی ئیمـامی عـام لـەبـۆ ڕەهبـەران
خـاوەن ئـالای عـام بـۆ پێغـەمبـەران
هـــاوڕاز و نیـــاز جیبریلـــی ئـــەمـــین
فوروســـتادەی حـــەق بـــۆ دەســـتووری دیـــن
شـابازی پـەرواز سـەمـاوات یـەکـسەر
بـۆ عـەرزی نیـاز لای خـودای ئـەکبـەر

ئـەی خـاوەن مـەقـام بـە (قـاب قوســين)
جـەددی ئـەمجـەدی (حـسن) و (حـسين)
لـە بـەر بـەرزی تـۆ بـە قـەدر و هیممـەت
ئوممـــەتـــت کـــرا بـــە (خيــــر أمـــه)
(خيــر امــه) بـوون بــە ســاغی ئیمــان
بــە فیــداکاری بــە عــەهــد و پــەیمــان
بە ئەمری مـەعـرووف، نـەهـی لـە مونکـەر
بــە خزمــەتی دیــن بـۆ خـودای ئـەکبــەر
ئـەوان بـوون لـە بـەر موحافـەزەی دیـن
دوو هیجـرەتیـان کـرد بـە دڵـی غـەمگـین
تەحەمولیان کرد بـە زەحمـەت و کولفـەت
لـە بـەر مانـەوەی مـەحـەببـە و ئولفـەت
دڵـیان خاڵـی کـرد لـە مـاڵ و لـە خـاک
لـــە نیـــشتمان و لـــە ئـــەولادی چـــاک
گیــانی خۆیــان و نـــەتـــەوە بـــە عـــام
کردیـان بــە قوربـان بـۆ دیــنی ئیـسلام
مـەککـە و مـەدینـە و نـەجـد و توهامـە
بـەوان دامــەزران لـە سـەر (سـەلامـە)
ئـەرزی ئـەردەن و خـاکی فـەلـەسـتین
بـە جوهـدی ئـەوان پـڕ بـوو لـە ئـایین
هـەتـا سـنووری بـەحـرەیـن و یـەمـەن
بـە جوهـدی ئـەوان گـەڕان بـە مـەئمـەن
لـــە ژیـــنی تـــۆدا لـــە پـــاش وەفاتـــت
بـــەوان دامـــەزرا ڕێـــی کـــەراماتـــت

بــە جوهــدی (صــدیق) ئیمــان دەمــەزرا
لــە نــەجــد و حیجــاز تــا خــاکی بوســرا
ئــەهلــی نیفــاق و موشــاغەبــەی کوشــت
خــوێنی خــەبیــسی موســەیلــەمــەی ڕشــت
حودوودی شــامات داخــڵ بــوون بــە دیــن
ترســیان کــەوتــە بــەر دوژمــنی بــێدیــن
جــەمعــی قورئــانی بــە تــەواوی کــرد
تــۆزی عینــادی لــە دڵان لابــرد
مــەجمــووعی نووســی لــە پێستی ئــاهوو
بــۆ دیــنی ئیــسلام خــۆی فریــاڕەس بــوو
لــە بــەر جیهــادی حــەزرەتی عومــەر
فــەتحــی جــەزیــرەی عــەرەب هاتــە ســەر
ئــەو بــوو ڕۆیــشتە (مــسجد الاقــصی)
لــە بــەر تــەوازوع لــە دوا ڕاوەســتا
فــەتحــی شــامی کــرد ولاتی عــالی
کــردی بــە مــەرکــەز لــەبــۆ مــەعــالی
عومــەر فــاتیح بــوو لــەبــۆ فــەلــەستین
بــەهــەشــتی دونیــا بــۆ ئــەسبابی ژیــن
ولاتی میــسری هێنایــە تاعــەت
دایمــەزران یاســای کیتــاب و ســوننەت
عێراقــی گــرت و ئــەیــوانی کیــسرا
ڕێگــەی کــافران لــەو شــوێنە بــەســرا
عومــەر فــەتحــی کــرد خــاکی کوردســتان
بــە عــەدلی ئــەو بــوو بــە بــاغ و بێستان

عومـــەر فـــەتحـــی کـــرد شـــارانی ئێـــران
کـــردی بـــە مـــەرکـــەز بـــۆ ســـوپای یـــاران
یـــەزدی جـــوردی کوشـــت لـــە خوراســـانا
ئیمـــــان دامـــــەزرا لـــــەگـــــەڵ ئیحـــــسانا
(ابولۆلـــــۆە)ی بـــــەد فیکـــــر و ڕەوشـــــت
خـــوێنی ئـــەو زاتـــەی لـــە نـــاو نـــوێژا ڕشـــت
پـــاش وەفـــاتی ئـــەو حـــەزرەتی عوسمـــان
بـــوو بـــە جێگـــەدار بـــۆ یاســـای ئیمـــان
بە یاسای (شوری) لە بەینی شـەش کـەس
عوسمـــان دامـــەزرا لـــە جێـــی موقـــەددەس
بـــۆ جـــاری دووەم لوجنـــەی دامـــەزران
بـــۆ یـــەکـــێتی خـــەت لـــە حـــەرفی قورئـــان
یـــەکـــێتی خـــەتی قورئـــان دامـــەزرا
دەفعـــــی خـــــیلافی ئـــــەم و ئـــــەو کـــــرا
بـــە قـــەد حـــورووفی ئایـــاتی قورئـــان
ڕەحمەت داباریێ بۆ ڕۆحی عوسمان
بـــۆ ئـــەو کـــەســـانەیـــش یارمـــەتییـــان دا
هـــەتـــا یـــەکـــێتی (قـــراءات) ڕووی دا
عوسمـــان بـــوو مایـــەی فوتـــووحی ئیـــسلام
عوسمـــان ڕۆحێکـــی تـــازەی دا بـــە عـــام
عوسمـــان بـــوو کـــانی شـــەرەف و حـــەیـــا
نـــووری ئیـــسلامی گـــەیانـــدە دونیـــا
سیرڕی ئەمـە بـوو سـەیـیدی کـەونـەیـن
عوسمـــانی کـــردە چـــرای (ذیالنـــورین)

لــە پــاش (رقیــە) بــێ تــوولی زەمــان
(ام کلثــــوم)ی هـــەم دا بـــە عوسمـــان
دوو جــار بــەهــەشــتی کــڕیوە عوسمــان
عوسمــان هێــزی دا بــە ئــەهلــی ئیمــان
فـــەوجـــی فریـــشتەی بـــەرزی ئاسمـــان
حــەیایــان ئــەکــرد لــە حــەیــای عوسمــان
ئـــەوەی کـــە بـــە دڵ عوسمـــانی نـــەوێ
بـــاری نابـــاری شـــەیتـــانی ئـــەوێ
جا لە پاش عوسمان لە سەر فیکری عـام
عــەلی هاتــە ســەر تــەختــەکــەی ئیــسلام
ئـــەو عـــەلی کـــەوا شـــێری خـــودا بـــوو
شمـــشێری دەســـتی (رســـول الله) بـــوو
عەلی موخلیس بوو بۆ دیــن بــە تــەحقیــق
کــە چــوو بــەیعــەتی فــەرمــوو بــە (صــدیق)
بەش و بەهرەی خۆی لە (صدیق) وەرگــرت
کـــە (حنیفـــە)ی لـــە بـــەشـــا هـــاورد
بــۆ یــەکــێتی دڵ بــۆ هێــزی کــەمــەر
(امکلثـــوم)ی بـــەخـــشی بـــە عومـــەر
بــەم یــەک ڕۆحییــە بــۆ ئــەوان ڕێکــەوت
دیــن و دەوڵــەتی ئیــسلامی ســەرکــەوت
بە هۆی یەک دڵــی و بــە هــۆی ئیتتیفــاق
ئــەحکــامی ئیــسلام گــەیــشتە ئافــاق
(ابوعبیـــدە)ی ئـــەمـــینی ئوممـــەت
موجاهیــد بــۆ دیــن بــە هێــز و هیممــەت

(عبدالرحمن)ی مەشهوور کوڕی عەوف
دنیای دا بە دین بێخەیاڵ و خەوف
هەزار وشتری بەخشی لەگەڵ بار
بۆ موسوڵمانی داماو و هەژار
ئەمجارە (سعدی بن ابی وقاص)
دوعا موستەجاب سەرچاوەی ئیخلاس
خاوەن شەجاعەت بە هێز و هیممەت
فاتیحی عێراق بۆ بەرزی ئوممەت
سەعید کوڕی زەید بە خێر و سەمەر
زاوای دڵئاوای حەزرەتی عومەر
جا بێ بڕوانە بۆ (طلحەالخیر)
خاوەن کەرامەت خۆش سولووک و سەیر
ئەمجا زوبەیری خاوەن کەرامەت
پوورزای حەزرەتی ڕەهبەری ئوممەت
(بأبی أنت وأمی) فەرموو
حەزرەت بە زوبەیر نە جارێک نە دوو
لە بەر دڵسۆزی و فیداکاری بۆی
داینا بە (خاصە) و (حەواری) بۆ خۆی
ئەو دە کەسانەی کە موبەششەرن
ئەمانەن (خاصە)ی (خیر البشرن)
ئەمجارە (خالد سیفالله)ی مەسلوول
خالید دەلیل و شەجاعەت مەدلوول
بم بە قوربانی یارانی بەدرت
فیداکارانی بە قووە و قەدرت

یــارانی بــەدری خــاوەن کــەرامــەت
ئـالای عیـززەتیـان هـەڵـکرد بـۆ ئوممـەت
ئەسحابی (احـد) خـاوەن بـەهـرەی نـوور
کە هـەڵـئەسووڕان لـە نـاو خـوێنی سـوور
ئەسحابی ئـەحـزاب، ئـەسـحابی حونـەیـن
(عبـاس) و (حمـزه) و (حـسن) و (حـسین)
مابــاقی یــاران نایــەنــە قــەڵــەم
قــــەدر و پایــــەیــــان (الله أعلــــم)
گــەلــێکن خــودا ڕازی بــوو لــەوان
ویستیــشی کــە لــەو ڕازی بــن ئــەوان
لـە چـەنـد ئایـەتـا ئـەمـەی ئـیعلان کـرد
ڕوتبـەی ئـەوانـەی بـە حـەق عـەیـان کـرد
بــە عــەشــەراتی ئایــاتی قورئــان
ســەنــای کــردوون خــودای (لامکــان)
لــەوانــەوە بــوو (روایــه)ی (کتــاب)
(روایـه)ی حـەدیـس بـە شـێوەی سـەواب
بـەوان دامــەزرا ئــەساســی ئیــسلام
گــەیــشتە عالــەم ئوســوولی ئــەحکــام
ســەرچــاوەی ڕوونــاک ئــاوی ڕووناکــە
لــێڵ بــوونی خــەتــای قــوڕاوی خاکــە
ئـەمانـە ئـەگـەر پـڕ نـەبـن لـە نـوور
چــۆن ڕوونــاکی دێ بــۆ عالــەمــی دوور
نــەخــەڵاتــابن بــە فێــڵی شــەیتــان
تانــە بنێنــە ســەر چــاوی ئــەوان

ئینسانی بێچاو نابێ بە دەلیل
ئادەمی بەدناو ناشێ بۆ کەفیل
(روایە)ی (ئاحاد) بە پێنج و بە چوار
جێی باوەڕ نییە بۆ نەقلی ئەخبار
با مەعسووم نەبن عەدلن ئەوانە
عیسمەت هەر لەبۆ پێغەمبەرانە
شایەتی داوە خودا بۆ ئەوان
پاکن بە وێنەی بیبیلەی چاوان
وەسییەتەکەم زۆر موقەددەسە
(وكفى باالله شهيدا) بەسە
ئەو کەسە قەدری ئەمانە نەگرێ
لە ژێری باری شەیتانا ئەمرێ
ئەو کەسە چارەی ئەوانەی نەوێ
قەزای کوندەبووی شوومی لێ کەوێ
(خير أمه أخرجت للناس)
(ذاتا) خیتابە بۆ ئەوان بەڕاس
یانێ واتەکەی لەگەڵ ئەوانە
لەوانەوە دێ بۆ ئەم زەمانە
خیتابی حازر ئەگا بە غائیب
(قرنا فقرنا على المراتب)
(رضى الله عنهم اجمعين)
جا بێنە سەیری زومرەی تابیعین
لەبۆ ڕیوایەی کیتابی موبین
لەبۆ ڕیوایەی ئەحادیسی دین

جـا بێنـه سـەیـری ئـەهلـی ئیجتیهـاد
ئـەسـحابی عـیلم و ئـەربـابی ڕەشـاد
ئەوان ئوسـتاد بـوون بـۆ شـەرح و بـەیـان
لـەبـۆ تـەفـسیری ئایـاتی قورئـان
لـەبـۆ (تخـصیص) و (تقییـد) و (تأویـل)
بۆ (نسخ)ی (ناسخ) بۆ (جـرح) و (تعـدیل)
جـا بێینـه سـەیـری عولـەمـای زانـا
بۆ جەمـع و تـەئلیـف بـۆ کـەشـفی مـەعنـا
میـدادی خامـەی عیلمـی عولـەمـا
بـەرانبـەره بـۆ خـوێنی شـوهەدا
میـدادی ڕەشـیان لـه سـەر ئـەوراقـا
خـوێنی شـەهیـده لـه ڕووی ئافاقـا
دین له سەر عیلمه و عیلمـیش بـێ‌گومـان
وا لـه نـاو سـینەی عولـەمـای زەمـان
عـالیمی عامیـل مـەرتـەبـەی بـەرزه
بـه ڕاسـتی وێنـەی چـرای سـەر عـەرزه
کـه چـرا نـەمـا جیهـان تاریکـه
ڕێگـەی هـاتوچـۆی گـەلـێ باریکـه
جـا بێینـه سـەیـری ئـەولیـای ئـەبـرار
دڵـیان بـه وێنـەی خـەزێنـەی ئـەسـرار
بـەوانـه پـاکن لـه تـۆزی نـەفـسی
بـه سـەفـای دەروون بـه سـۆزی قودسـی
خۆزگـەم بـەو کـەسـه هاومـەتـلەبیانـه
لـه هـەر دوو دونیـا هاومـەشـرەبیانـه

ئومـــەرای عـــەدل و ئـــەعـــوانی ئـــەوان
هـــەمـــوو نـــزیکن لـــە عـــەتـــای (رضـــوان)
کاســـــبانی پـــــاک لـــــە ڕووی دونیـــــادا
وەســیلەی خــەیــرن لــە گــشت مــەئــوادا
دەوڵـــەمـــەنـــدانی خـــاوەن دەهـــەنـــدە
لـــە دونیـــا و دینـــا زۆر بـــەهـــرەمـــەنـــدە
(مـــن انعـــم الله علیـــه فـــی الـــدین)
وان لـــــە قورئانـــــا (بعـــــد النبیـــــین)
بـــە (صـــدیقین) و شـــوهەدا و ســـالیحین
(رضـــــــی الله عـــــــنهم أجمعـــــــین)
ئـــەی پێغـــەمبـــەری شـــیرین ڕەنـــگ و بـــۆ
ئوممـــــەتێکـــــی وا لایقـــــە بـــــە تـــــۆ
کـــە گـــرد ئـــەبنـــەوە بـــۆ باســـی ئـــەخبـــار
فریـــشتەی فـــەلـــەک بـــە پـــۆل دینـــە خـــوار
دڵ و دەروونیـــــان مونـــــەووەر ئـــــەبـــێ
دەماخیـــان بـــە حـــەق موعـــەتتـــەر ئـــەبـــێ
(لـــک الـــسلام ولهـــم رضـــوان)
هـــەتـــا ئـــەمێـــنن گـــەلی پـــەیـــڕەوان
ئـەی پێغـەمبـەری سـەر تـا قـەدەم نـوور
خـــاوەن کیتـــاب و ســـوننەت و دەســـتوور
بـــە یـــارانی تـــۆ دونیـــا بـــوو بـــە بـــاخ
کـــافران مـــردن لـــە بـــەر دەرد و داخ
بـــەوان دونیـــا بـــوو بـــە (دارالاحـــسان)
لـەگـەڵ وەیـشوومە و ڕەشـەبـای بـێسـان

درەختی باخی ئیمان و ئیحسان
بەوان هاتە بەر بۆ دینپەرستان
بە فیداکاری یارانی دڵدار
گەلێ لە جیهان بووە بە گوڵزار
بە موتابەعەی زومرەی تابیعین
بە موجاهەدەی گشت موجتەهیدین
ئەم جیهانە بوو بە باغی ڕیزوان
سەدهەزار ڕەحمەت لە ڕۆحی ئەوان
ئەمانە هەر چەند دوور بن بە نەسەب
ئال و ئەولادن بە یاسای حەسەب
سا بۆ خاتری هەموو ئەمانە
(نامی) موحتاجی فەیزی ئیحسانە
سەیلی وادییە بەرەکاتی تۆ
دەریای هادییە کەراماتی تۆ
لە دەریای دووری عالم و عامی
بەشێ کەرەم کە بە دڵی (نامی)
ئەی خاوەن بەها و مەقام و مەتاع
دوایی تەمەن بوو (حجه الوداع)
(حجه الوداع) بۆ ماڵئاوایی
بۆ فەیزی ئەنوار پرتەو نومایی
تەوافی بەیت و ڕوکن و مولتەزەم
شوربی موبارەک لە ئاوی زەمزەم
نوێژی سوننەتی مەقامی خەلیل
جا سەفا و مەروەی مەقامی جەلیل

نووسـتنی مینـا و وەقفـەی عـەرەفـات
بـە دوعـا و نـزای داوای بـەرەکـات
جـا ئیفـازەی خـەیـر بـۆ مـوزدەلیفـە
بـەردەبـارانی شـەیتـانی کولفـە
بـە هاتنـەوەی مینـای موبـارەک
بـۆ ئـەدای بـاقی کـاری مـەناسـیک
هەر بە دەسـتی خـۆت بـە قـەدەر عـومرت
قوربانیـت فـەرمـوو بـۆ وەفـای ئـەمـرت
ئایـەی تـەواوی دینـت لـەبـۆ هـات
لـە مینـای پـیرۆز خـاوەن بـەرەکـات
جـا چوویتـەوە بـەیـت بـۆ ئـەدای واجـب
لـەبـۆ بولـەنـدی پایـە و مـەراتیـب
لـەگـەڵ حـەجـاجی یـارانی ئـەخیـار
دڵـسۆزانی حـەق سـەد و دە هـەزار
چوونـەوە مینـا بـۆ ڕەجمـی شـەیتـان
نوسـوک تـەواو بـوو بـە ئـەمـری مـەننـان
لـە مـەناسـیکدا کـەمیـت نـەهێنـا
فـەرمـانی خـودات بـاش بـەجـێهێنـا
لـە پـەنـای بـەیتـا خوتبـەخوێنیـت کـرد
پـەردەی گومانـت لـە عالـەم لابـرد
ئیعلانـت فـەرمـوو حـەقـایقی دیـن
دەرکـەوتـن لـە لای ئـەربـابی یـەقـین
خواحافیزیت کـرد لـە بـەیـت لـە حـەرەم
لـە ڕوکـن و مـەقـام لـە ئـاوی زەمـزەم

بـە قوربانـت بم بـۆ سـۆزی جـەرگـت
بـە دڵ ئـەتـزانی نزیکـی مـەرگـت
جـا گـەڕایتـەوە بـەرەو مـەدینـە
لـەبـۆ خزمـەتی ئـەم یاسـا و دینـە
لـە ڕێـدا لـە لای گـۆلاوی (خـوم)دا[1]
بـۆ بـەیـانی دیـن خوتبـەیـەکـت دا
ئـەوەی موهیممـە تیـا بـەیانـت کـرد
لـە کـەشـفی دینـا شـەرحێکـت هـاورد
قورئـانی پـیرۆز کـە نـازڵ بـوو بـۆت
لـەگـەڵ سـوننەتی موبـارەکـی خـۆت
کـردت بـە ئـەسـاس بـۆ دیـنی ئیـسلام
لـە نـاو سـەحابـە و عولـەمـای ئـەعـلام
هـەتـا ئوممـەتـت لـە سـەر ڕوونـاکی
پایـەدار بـبن بـە دەروون پـاکی
هـەر فـەقـەرەیـەک کـە بـەیانـت کـرد
ئـەسـحابەکانـت بـە دڵ وەریـان گـرت
بـەجێیـان هێنـا بـە پێـی توانـا
لـە چـاو زورووفی جێگـا و زەمانـا
قوسووریان نەکرد خاوەن هیممـەت بـوون
لـە بـەر عـەدالـەت چـاتر ئوممـەت بـوون
کـەسـێ درۆیـەک بـێنی لـە بـەینـا
یـا تـۆز و گـەردێ بـدا بـە عـەینـا

١ گۆلاوی خوم: غدیر خم، ناوی جێگایەکە.

هـــەمـــوو درۆيـــە پووچـــە و بـــەتاڵـــە
گومـــڕايی هـــەمـــوو ئوممـــەت مـــەحاڵـــە
كيتـــاب و ســـوننە و ئيجمـــاعی ئوممـــەت
يـــاوەكـــوو زۆربـــەی بـــەســـە بـــۆ ئوممـــەت
بـــە واتـــەی ئـــەهلـــی هـــەوا گـــوێ مـــەدەن
كـــــاتی زۆر دويـــــن خۆتـــــان لابـــــدەن
ئەمە بوو حوججـەت ئـەی خـاوەن مـەقـام
جـــا هاتيتـــەوە مـــەدينـــەی ئيـــسلام
وەكـوو لـەوەبـەر بـە قـەدر و تـەمكـين
بـــە دڵ حـــازر بـــووی بـــۆ ئومـــووری ديـــن
جـا ئـەی ڕەسـوولی مـەحبـووبی خـودا
چـــرای چـــلچـــرای ڕێگـــەی ئيهتيـــدا
ئوممـــــەتـــــەكـــــەی تـــــۆ (خيرالأمـــــە)ە
ســـەربـــەرزی دونيـــا و شـــای قيامـــەتـــە
قـەت نـەبـووە گوڵـزار بـێ ئـازاری خـار
قـەت نـەبـووە دەريـا بـێ هـەوا و بوخـار
بـا سـافی هـاتی و دەرچـووی بـە سـافی
حـــــــسبک الله و نعـــــــم الكـــــــافی
پـاش حـەسـانەوەت بـۆ مـاوەی دە سـاڵ
هاتـــە خـــوارەوە ئايـــەی پـــڕ كـــەمـــاڵ
(واتقـــوا يومـــا ترجعـــون فيـــە)
بـــۆ بانـــگ كردنـــت كافييـــە كـــافی
كـە نـەخـۆش كـەوتی ئـاخری سـەفـەر
زانيـــت نزيكـــە مـــەوســـيمی ســـەفـــەر

ســـدیقت دانـــا بـــە شـــێوەی ئیمـــام
وەکـوو وەلیعـەهـد بـۆ تـەخـتی ئیـسلام
دەرگـای هـاتوچـۆ بـەسـرا لـە یـاران
(الا) ڕێـی (صـــدیق) گـەورەی ئیمامـان
هـەتـا دووشـەممـەی (ربیـــع الاول)
وەکـــوو وەلادەت لـــە جـاری ئـــەوەڵ
ڕۆحـــت دایـــە دەس فریـــشتەی قـــەزا
چـوو بـۆ بـارەگـای ڕەحمـــەت و ڕەزا
وەفات دووشەممە و دەفنـت چوارشـەممـە
کـــەرامـــەتێکـــی شـــاهی خاتـــەمـــە
تـــا لـــەو مـــاوەدا چـــوارده هـــەزار
نـــوێژی جـــەنـــازەت کـــرا بـــە گوڵـــزار
جـەسـارەت نـەکـرا کـە بـە جـەماعـەت
نـوێژت بـۆ بکـرێ ئـەی خـاوەن ڕیفعـەت
هەر لە پـێش وەختـا ئـەی (خیـر الانـام)
(صـــدیق) دامـــەزرا بـــە پایـــەی ئیمـــام
هـەتـا مـەعلـووم بـێ کـە ئوممـەتی تـۆ
ئامـــادەن لـــەبـــۆ شـــەریعـــەتی تـــۆ
ئـەگـەر ئیجمـاع بـوو (فـنعم الاجمـاع)
یـان ئـەکـسەریـەت گـەرا بـە ئیجمـاع
چـون لـەو مـەتلـەبا هـەر کـەسێ مـابوو
هـات و بـەیعـەتی فـەرمـوو زووبـەزوو
(مـاجری) وابـوو بـە ڕووی حـەقیقـەت
هـــەر حـــەقیقـــەتـــە عـــەینـــی تـــەریقـــەت

«فمـــــــن الله الســـــــلام عليـــــــك
اذ قلـــــت حقـــا لبيـــــك لبيـــــك»
«والآل و الـــــصحب ثـــــم التـــــابعين
وأتبـــــاعهم الـــــى يـــــوم الـــــدين»

## بەیانی مەناقیب و نوعووتی درووودی خوای لێ بێ

ئـــەی پێغـــەمبـــەری خـــاوەن مـــەعـــالی
ســـەنـــات گـــەوهـــەرە و دووڕ و لـــەئـــالی
فـــەیـــزی بـــۆ عالـــەم بـــە ڕۆژ و بـــە شـــەو
بـــە شـــەوا ڕەحمـــەت بـــە ڕۆژا پرتـــەو
دوڕڕی یـــەتـــیم بـــووی لـــە ســـولبی ســـەدەف
لـــە دەریایـــەی ڕەحمـــەت کـــەوتیتـــە تـــەرەف
کـــەس قیمـــەتی تـــۆ تـــەواو نازانـــێ
چـــون وێنـــەت نییـــە لـــە هـــیچ مـــەکانـــێ
هاتیتـــە دنیـــا بابـــت نـــەمـــابوو
بـــەلام بـــۆ قـــەدرت عالـــەم وەســـتابوو
فـــەقـــیر ڵ بـــووی بـــە مـــاڵ ئـــەمـــیر بـــە کـــەمـــا
یـــانی دارا بـــووی بـــۆ حـــاڵ و ئـــەحـــواڵ
دایـــک و بـــاپیرت دەرچـــوون لـــە دنیـــا
بـــەلام مـــامی خـــۆت بـــوو بـــە ڕەهنومـــا
کـــە مامـــت ڕۆیـــی جیبریـــل بـــۆ عـــیلاج
هـــات و بـــردیتی بـــۆ ئیـــسرا و میعـــراج
کـــە بـــڕیاریان دا دوژمـــنی پـــڕ قـــین
کـــە لـــە نـــاو ببـــەن ڕەســـوولی ئـــەمـــین

(صـــدیق) بـــوو بـــە یـــار جیبریـــل بـــە دەلیـــل
هـــەتـــا مـــەدینـــەی پێتـــەخـــتی جـــەمیـــل
کـــە دوژمـــن ئـــەهـــات بتـــدا بـــە عـــەرزا
خـــودا دای ئـــەنـــای لـــە شـــوێنی بـــەرزا
بـــۆ دوژمـــن وابـــووی بـــە ئـــەمـــری خـــودا
کـــە دەرئـــەکـــەوتی ئـــەبـــوون بـــە هـــەوا
بـــۆ نیـــشان دانی جـــەلالـــەتی تـــۆ
لـــەبـــۆ بورهـــانی ڕیـــسالەتی تـــۆ
گـــەلـــێ مـــوعجیزەت هـــاتن بـــۆ مـــەیـــدان
مـــەقـــامی تۆیـــان هێنـــا بـــۆ عـــەیـــان
ۆ بـــووی لـــە دارێ ئیـــشارەتـــت کـــرد
هـــەڵـــکنراو هـــات و ســـەلامـــی لێـــت کـــرد
تـــۆ بـــووی کـــە ئـــەچـــووی بـــە ڕێـــی گـــوزەردا
ســـەلامـــت ئـــەبیـــست لـــە دار و بـــەردا
تـــۆ بـــووی وەردە بـــەرد لـــە دەســـتی تـــۆدا
تـــەســـبیحاتی کـــرد بـــۆ زاتی خـــودا
ئیـــشارەی تـــۆ بـــوو بـــە مـــوعجیزەی حـــەق
بـــتی ئـــەڕووخانـــد بـــۆ ســـەر عـــەرزی ڕەق
ئیکرامـــی تـــۆ بـــوو ئـــەی شـــای ڕەهبـــەران
عـــەزابی دوا خـــست لـــە تاوانبـــاران
تـــۆ بـــووی لـــە بـــەیـــنی پـــەنجـــەی دەســـتانت
ئـــاو هـــەڵـــئەقـــولا بـــۆ دۆســـتانت
مـــوعجیزەی تـــۆ بـــوو کـــەمـــێ لـــە تـــەعـــام
کـــافی بـــوو لـــە بـــۆ گـــەلی (خـــاص) و (عـــام)

لــە فیراقـــی تــۆ کۆڵــەکــەی مزگــەوت
کاتــێ قــەدەمــت بــۆ مینبــەر ســەرکــەوت
ئــەینالانــد بــە جــۆش لای مینبــەری تــۆ
لــە دووری بــالای بــاش دڵــبەری تــۆ
تــۆ داریکـــت دا بـــە (ابـــن فرقـــد)
بـۆی بـوو بـە شمـشێر بڕنـدەی بـێحـەد
تفــی دەمـــی تــۆ بــۆ چــاوی عــەلی
چـاتر بـوو لـە سـەد قـەتـرەی سـەیـدەلی
بۆنــت خۆشــتر بــوو لــە عــەتــری گوڵــباخ
بــەری دەســتت بــوو دەرمــانی ناســاخ
تــەماشــای بــالای ڕەهبــەری نــازدار
چەند قات خۆشتر بـوو لـە سـەیـری گوڵـزار
بــە قوربانـــت بم ســـەربــەرزی ئافـــاق
مــوعجیزەت ناگــا بــە بــەرزی ئــەخــلاق
تـــۆی موخاتـــەبی خـــالیقی عـــەلـــیم
(انـــک لعلـــی خلـــق عظـــیم)
نامـــە ناگاتـــە بـــەرزی مـــەقامـــت
خامـــە نانووســـێ پایـــەی ئیکرامـــت
(نـــامی) بـــە فیـــدای خاکپـــای تۆیـــە
بگـــات بــە دڵــی کــەمــێ لــەو بۆیــە
هــەرچـــی بنووســـم لــە ســەنــای تــۆدا
پــەڕەی گوڵــێکە لــە بــاخی تــۆدا
ســوجدەی داری ســەوز وتــاری حــەیــوان
قوبووڵــی دوعــات لای خــودای یــەزدان

دوو کـەرت بـوونی مانـگ بـە ئیـشارەی تـۆ
بــوون بــە دەلیلــی ڕیــسالەتی تــۆ
ئیــسرا و میعراجــت بــە ئــەمــری خــودا
هـاتوچـۆی فـەلـەک بـێدەنـگ و سـەدا
بـوو بـە مـوعجیزەت بـە تـوولی زەمـان
لــە لای زانایــان ئایــاتی قورئــان
جامیعــە لــە بــۆ ئــەسـراری پــەنهـان
بـۆ سـوودی عالـەم لـە سـەر ڕووی جیهـان
مــەعــان و بــەیــان بــەدیعــی عولــووم
ئیمـا و ئیـشارە و مـەنتـووق و مـەفهـووم
هــەمــوو دەلــیلن قورئــان مــوعجیزە
(ماســوی) بــە حــەق لــە ڕووی عــاجزە
لــەمانــە ڕوونتــر ڕەوشــتی تــۆ بــوو
عـەهـد و پـەیمـان و سـەربـەستی تـۆ بـوو
تــەوەککــولی تــۆ لــە ســەر زاتی حــەق
نــەترســانی تــۆ لــە عــەدوو موتــڵەق
کــەرەم و ســەخــا و ڕەحــم و دڵــسۆزی
دەلــیلن لــە ســەر پایــەی پــیرۆزی
ســیفاتی زاتی پــاکی پێغــەمبــەر
دەلــیلن لــە ســەر ڕیــسالەی ڕەهبــەر
(آثــار)ەکانــت ئــەبــن بــە بورهــان
بــۆ مــەقــامی تــۆ زاهــیر و پــەنهــان
ڕۆحــی وجــوودی خــاوەن شــوهوودی
خــاوەن مــەقــامی عــالی مــەحمــوودی

بـــەو پایـــە بـــەرزە بـــۆ تـــۆ هاتـــە نـــاو
لـــەبـــۆ «کائنـــات» بـــووی بـــە نـــووری چـــاو
بـــەڵـــکوو بـــووی بـــە ڕۆح لـــە بـــۆ کائنـــات
بووی بە هۆی فوتووح لـە ڕووی سـەر بـسات
هـەر تـەنیـا تـۆ بـووی بـە قـەدر و تـەمکـین
کـــرای بـــە ڕەحمـــەت لـــەبـــۆ عالـــەمـــین
تـــۆی زەوی هـــەمـــووی بـــۆ تـــۆ مزگـــەوتـــە
خـــاکی تـــەیـــەممـــوم ئـــاوی ئـــەشـــکەوتـــە
تـــۆی ئـــەووەڵ خـــاریج لـــە خـــاکی قـــەبـــرا
ئـــالا هـــەڵئـــەکـــەی لـــە ســـاحەی حـــەشـــرا
تـــۆی کـــە ئـــادەم ئـــەهلـــی دیـــن بـــە عـــام
لـــە ژێـــر ئالاتـــان بـــە بـــەرزی مـــەقـــام
تـــۆی کـــە خـــاوەنی (حـــوض المـــورود)ی
مـــەجمـــەعـــی هـــەمـــوو خـــاوەن ســـوجوودی
تـــۆی یـــەکـــەم کـــەســێ ئـــەڕواتـــە بـــەهـــەشـــت
بەهەشـــتت بـــە قـــەد ئـــەرز و ئاسمـــان گـــشت
تـــۆی خـــاوەن پایـــە و شـــەفاعـــەی کـــوبرا
لـــەو کاتـــا دەرگـــای شـــەفاعـــەت بـــەســـرا
تـــۆی ســـەر دائـــەنێـــی بـــە عـــەرزی ســـوجوود
ئـــەپارێیتـــەوە لـــە خـــودای مـــەعبـــوود
تـــۆی هـــۆی ڕزگـــاری عالـــەمـــی مـــەوقـــووف
تـــا ڕزگـــار ئـــەبـــن بـــە یاســـای مـــەعـــرووف
تـــۆی بانگـــت بـــۆ دێ بـــە ســـەربولـــەنـــدی
بـــۆ تکاکـــاری بـــە ئـــەرجومـــەنـــدی

تـۆی تکـا ئـەکـەی بـۆ هـەمـوو عالـەم
یانـێ بـۆ (جـن) و بـۆ بـەنیئـادەم
تـۆ ڕزگـار ئـەکـەی لـە ئاگربـاران
چ بـێتـاوان و چ تاوانبـاران
تـۆی تکـا ئـەکـەی بـە عـەفـوی هـەمـوو
گـەورە یـا بچـووک بـە هـەر جـۆرێ بـوو
تـۆ تکـا ئـەکـەی بـۆ هـەنـدێ تـاوان
تـاوانی گـەورە، بـۆ پـیر و لاوان
تـۆی تکـا ئـەکـەی بـۆ بـەرزی پایـە
ۆ موسولـمانی بـە پایـە و مایـە
تـۆی کـە ئوممـەتـت وەکـوو بـەرقـی وەشـت
بـە سـەر سـیراتا ئـەڕۆن بـۆ بـەهـەشـت

## جا داوای تکایە

ئـەی سـەردارەکـەی عـەجـەم و عـەرەب
ئـەی سـەرچـاوەکـەی ئـەخـلاق و ئـەدەب
وەک تکـا ئـەکـەی لـە عـەرەسـاتا
موحتـاجی تکـاین لـەم کـارەسـاتا
وان لـە تـەنگـاوا هـەمـوو ئوممـەتـت
بـا بێنـە سـایەی ئـالای هیممـەتـت
عـیلم و عـەمـەل و ئیمـان و ئـەمـان
وان لـە بـەر بـەلای ڕەشـەبـای زەمـان
ئـەگـەرچـی مـەسـت و دوور لـە سـەوابـین
ئوممـەتی شـەفیـع ڕۆژی حیـسابین

هەرچەندە فیتنەی ئاخر زەمانە
بەلام قاپی تۆ، قاپی ئەمانە
تکاکارەکەی ڕۆژەکەی نەهات
بەلکوو هاواری ئوممەت بێتە لات
ڕۆلە ئەگەرچی نامەرد و (عاق)ە
هەر ڕۆلەی باوکی خاوەن ئەخلاقە
پەنامان بدە ئەی خاوەن پەنا
با بەردەوام بێ ئاوازەی سەنا
خەلایق سەرجەم وان لە ماتەمدا
چ لە عەرەبدا چ لە عەجەمدا
لە بەر باری دڵ بە تاوانباری
ئەپاڕێمەوە بە شەرمەساری
تۆ بیت و بەهرەی خودا دادەکەت
تۆ قەدری دینی پڕ ئیرشادەکەت
تۆ نووری قورئان لە سینەی خۆتا
تۆ نووری ڕەحمەت لە ڕەنگ و بۆتا
تۆ ئەهلی بەیتی بەرزی نەبەوی
خاوەن مەقام و ڕوتبەی مەعنەوی
تۆ مەحەببەتی ئالی کیرامت
ئالی شەریفی خاوەن مەقامت
تو مەحەببەتی ئالی کیرامت
بەتایبەت زەهرا فاتیمەی بەتوول
تۆ مەحەببەتی نەسلی نەبەوی
خاوەن کەرامە و فەیزی مەعنەوی

ئـەمجـا تـۆ سـیرڕی دەروونی (صـــديق)
کـە بـوو بـە کـانی بـۆ نـووری تـەوفیـق
ئـــەمجـــار بـــە دادی خادیمـــت عومـــەر
عـومری فیـدا کـرد بـۆ شـەرعـی ئـەنـوەر
تـو نـووری عوسمـان چـرای (ذیالنـــورين)
دوو جـار بـەهـەشـتی کـڕیوە بـە عـەیـن
تـــو عیلمـــی عـــەلی حـــەیـــدەری کـــەڕڕاڕ
شـــێری مـــەیـــدانی جیهـــادی کوففـــار
تو حەمزە و عەبباس خـاوەن نـووری عـەیـن
تـو پایـەی حـەسـەن ئـەمجـارە حوسـەیـن
تو بی و دەست و پێـی جـەعفـەری تـەییـار
لـە (مووتـە)دا چـوون بـە دەسـتی کوففـار
تـــو موحـــەممـــەدی حـــەنـــەفی دوڕنـــاس
تـو حیـبری مـەشـهوور بـە (ابـن عبـاس)
تـــو ئـــەمانـــەتی (أبـــو عبيـــده)
بـۆ خـودای عالـەم بـە ڕاسـتی بـەنـدە
تـو (عبـدالرحمن) لـە نـەتـەوەی عـەوف
لـــە ڕێـــی خـــودادا مالـــی دا بـــیٚخـــەوف
تـو (سـعد) و (سـعيد) شـێرانی ئافـاق
خـــاوەن ئیمـــان و ئیحـــسان و ئـــەخـــلاق
تـو خدمـەتکـاری (طلحـە)ی خـاوەن خێـر
بـــۆ فیـــداکاری حـــەواریـــت (زبیـــر)
تـــو ســـەلمـــانی پـــاک (ســـلمان منـــا)
خـــاوەن کـــەرامـــەت دڵ وێنـــەی مینـــا

لـە بـەر (خالـدی سـیفالله)ی مـەسلوول
خـاوەن کـەرامـە و دەرەجـەی قبـوول
بـە خـوێنی پـاکی مابـاقی یـاران
کـە بـوو بـە ئـاوی بـاخی دینـداران
بـە ئـەهلـی بـەدری بـە قـەدر و شـەرەف
کـە بـەوان دوژمـن دەرچـوون بـە تـەلـەف
بـە ئـەهلـی ئوحـود، بـە ئـەهلـی ئـەحـزاب
بـە گـەلی خـەیبـەر ئـەربـابی سـەواب
بـە گـەلی بـەرزی (بیعـە الرضـوان)
دەسـیان نایـە دەس ڕەهبـەری زەمـان
کـە دەسـتی خۆتـت نایـە دەسـتی خـۆت
ئـەم واتـە بـەرزەیـش سـادر بـوو لـە بـۆت:
ئـەم دەسـتە لـە جێـی دەسـتی عوسمانـە
ئـەم دەسـتە دەسـتی عـەهـد و پـەیمانـە
بـە ئـەهلـی فـەتحـی مـەککـەی موبـارەک
بـە ئـەهلـی حونـەیـن خـاوەن تـەدارەک
بـە خـوێنی پـاکی مابـاقی یـاران
کـە بـوو بـە ئـاوی بـاخی دینـداران
بـە وەفـا و سـەفـای زومـرەی تـابیعین
(رضـی الله عـنهم اجمعـین)
بـە خامـە و نامـەی ئـەهلـی ئیجتیهـاد
خامـەیـان وێنـەی شمـشێری جیهـاد
بـە سـەفـای سینەی ئـەولیـای عالـەم
بـە عولـەمـای دیـن عـالیم و ئـەعلـەم

بــــە ســــالیکانی ڕێگــــەی ســــەعــــادەت
بــــە مالیکــــانی خــــاوەن عیبــــادەت
بــە هــەر بــەنــدەیــە بــە دڵ زینــدووە
لــە ڕێگــەی دینــا بــە حــەق مــردووە
لا بکــــەرەوە بــــە دوعــــای ڕەحمــــەت
لــەبــۆ ڕزگــاری مــەجمــووعی ئوممــەت
کــوێرە فیتنــەکــان بــاش دەرکــەوتــووە
نیــسبەتی تووفــان چــاک ســەرکــەوتــووە
بــۆ ئــەهلــی ئیــسلام لــە بــەنیئــادەم
فیتنــەی ئیفــسادە هــاتووەتــە عالــەم
تــەنیــا ڕەحمــەتی خودایــە چــاری
لــە ســەر تکــای تــۆ چونکــە نــازداری
لــەمــە زیــاتر بــا ســەددی نــەشــکێ
ڕجایــە ســوپای موســیبەت بــشکێ
هــەر تــۆی پــەنامــان یــا خــیر الانــام
بــڕژێ بــە ســەرتــا ســەلات و ســەلام
جــا بــە قوربــانی پایــەی بــەرزت بم
فیــدای پــیرۆزی ڕووی ســەر عــەرزت بم
پاســەوانــەکــەی بــەر دەرگاکــەی تــۆم
ســەد جــار دەرمکــەی نــاتوانم بــڕۆم
بــەتایبــەتی خــۆم زیــاد لــە هــەمــوو کــەس
بــە دڵ دامــاوم بــۆ فــەیــزی ئــەقــدەس
بــەڵــکوو بــڕوانی بــۆ حالــی (نــامی)
تــا بــژی و بمــرێ لــەگــەڵ ئیــسلامی

تـــا پـــاک بێتـــەوە لـــە تـــۆزی خـــامی
وەربگـــرێ نامـــەی حوســـنی خیتـــامی
ئـــەم دەفتـــەریـــشە کـــە دامنـــاوە بـــۆت
لـــێم قوبـــووڵ بکـــەی بـــە ئیحـــسانی خـــۆت
ســـەراســـەر هـــەمـــوو ســـەنـــای ڕەهبـــەرە
باســـــی ســـــیفاتی زاتی ئـــــەنـــــوەرە
باســـی هـــەر کـــەس بـــێ هـــەر لـــەبـــۆ تۆیـــە
تـــۆی دەســـتەگولـــی ماســـیوا بۆیـــە
کـــوردان تێناگـــەن ئـــەســـراری بـــوردی
بۆیـــە دەســـم بـــرد بـــۆ ســـەنـــای کـــوردی
لـــەبـــۆ ڕەهبـــەرە ســـورووودی فـــەردم
ئـــەیکـــەم بـــە مایـــەی دەرمـــانی دەردم
ملیـــارێ دەفتـــەر وەســـف و ســـەنـــای تـــۆ
ناگاتـــە ســـەنـــای ئـــالای بـــالای تـــۆ
دیـــاری بـــە گـــوێرەی دیـــاری هـــاوەرە
قـــەی ناکـــا ســـەروەر نـــووری ئـــەنـــوەرە
ســـەڵات و ســـەلام بـــە قـــەد عیلمـــی حـــەق
بێتـــە خـــوارەوە تـــەبـــەق بـــە تـــەبـــەق
وەکـــوو بـــارانی کـــاتی بـــەهـــاری
دانـــە دانـــەی ســـاف وێنـــەی مـــرواری
ببـــارێ بـــە ســـەر (روضـــه)ی خاکتـــا
ببـــارێ بـــە ســـەر ڕۆحـــی پاکتـــا
لـــە ســـەر یـــاران و ئـــال و پـــەیـــڕەوان
بـــە دەوامـــی ڕۆژ، بـــە تـــوولی شـــەوان

جـا (نـامی) ئـەڵـێ: بـە حـەیـا و تـەمکـین

«الحمـــــــــــــد لله رب العـــــــــــــالمین»

## بەشی دووەم: سەنای یاران سکالا

بسم الله الرحمن الرحیم

پاش ستایشی خەللاقی عالەم
بەخشندەی شوعوور، بە بەنیئادەم
لە پاش دوروودی بێحەدد و حیساب
بۆ پێغەمبەر و بۆ ئال و ئەسحاب
ئەم نامە سەنای گەلی یارانە
پیرۆزی چەرخی ڕۆزگارانە
گەلی یارانی حەزرەتی ئەنوەر
فوروستادەی حەق یانی پێغەمبەر
یارانی بەرزی فیداکارانی
شێرانی ئەرزی هیممەتدارانی
ئەستێرەی نووری ئاسمانی بەرز
چرای کارەبای سەد نمرەی سەر ئەرز
چرای هیدایەت، لەبۆ موهتەدی
پێشەوای ڕەحمەت، لەبۆ موقتەدی
گەلی ستایش وا لە قورئانا
لە باسی سەنای زاتی ئەوانا
بۆ کۆمەڵ بۆ فەرد، عومووم و خوسووس
نەک بە کینایە، بە شێوەی نوسووس
چونکە نگین بوون، بۆ خاتەمی دەس
بۆ پەنجەی حەزرەت، ڕەهبەری ئەقدەس

ئـەو پـەنجـە کـەوا مـانگی دوو لـەت کـرد
جێی بـە نامـەرد و سـەرسـەری لـەق کـرد
ئـەو پـەنجـەی لـەبـۆ تـەوحیـدی خـودا
بـــەرزی کـــــردەوە، ئـــالای (الا الله)
ئـەو پـەنجـە کـەوا لـە ڕووی کائینـات
حـەلـلال بـوو لـەبـۆ گرێـی موشـکیلات
ئـەو پـەنجـە کـەوا، لـە ڕووی جیهانـا
ڕۆیـــی بـــە نـــاوی چـــاوی شـــەیتانـــا
ئـەو پـەنجـە کـەوا کـردی ئیـشارە
بـۆ تـەوحیـدی حـەق لـە سـەر منـارە
پـەنجـەی ئـەو دەسـتە، کـە کـوفری پـەس کـرد
شـەیتـانی شـوومی تـەنگـە نـەفـەس کـرد
ئـەو دەسـتە کـەوا قورئـانی وەرگـرت
لـەبـۆ ئـەهلـی حـەق بـەیـانی دەرکـرد
ئـەو دەسـتە کـەوا چـرای هـەڵگیرسـان
بـۆ ڕووناکی و دڵ بـۆ پـەری و ئینـسان
دەسـتێ دایکوتـا، کۆڵـەکـەی عـەلـەم
بـۆ بـانگی ئیـسلام، لـە سـەر ڕووی عالـەم
دەسـتێ بـۆ قورئـان، دەسـتێ لـە بـۆ شـیر
دەستێ بـۆ تـەکـبیر، دەسـتێ بـۆ تـەدبـیر
مـــن بم بـــە فیـــدای خـــۆی و یـــارانی
شـــــێرانی مێـــــژووی ڕۆژگـــــارانی

شـیرانی دڵـپاک وێنـەی شـیری سـاف
شـێرانی بـێبـاک لـە تـیری مـەسـاف
شیرانی هـەڵـمەت بـۆ ڕۆژی مـەیـدان
فریـــشتەی ســـیرەت، لای بـــرادەران
شـــێرانی دەوری ڕۆژی بـــێدەســـتی
دەورانی کـــوفر و ســـەنـــەم پـــەرســـتی
شـــێرانی خـــۆگر بـــە ئـــێش و ئـــازار
بـــۆ ڕاگـــرتنی دیـــنی پایـــەدار
شـێرانی دوو کـۆچ بـۆ خـاکی حـەبـەش
لـە دەسـتی کوففـار گـورگی چـارەڕەش
شـێرانی هیجـرەت لـەبـۆ مـەدینـە
تـەرکـی وەتـەنکـەر لـە بـەر ئـەم دینـە
شـــێرانی بـــەدر و ئوحـــود و خـــەیبـــەر
شـــێری فیـــدایی بـــۆ گیـــانی ڕەهبـــەر
شـێرانی فـەتحـی مـەککـەی موبـارەک
شـــێرانی حونـەیـەن خـاوەن تـەدارەک
شـێرانی فـەتحـی سـەقیـف و تـائیف
شـــێرانی خـــاوەن نـــووری مـــەعـــاریف
شـــێرانی پـــارێز بـــۆ زاتی ڕەهبـــەر
سـدیق و عومـەر عوسمـان و حـەیـدەر
شـێرانی نووسـەر بـۆ هـەمـوو قورئـان
بـۆ مانـەوەی دیـن تـا ئـاخر زەمـان
تـــاریفی کامیـــان بکـــەم بـــە خامـــە
ســـەنایـــان نـــاکرێ بـــە هـــەزار نامـــە

تاریفیـــان نایـــە لـــە خامـــە و نامـــە
ئـەعلامـی دیـن بـوون بـە خاسـە و عامـە
ئــەوان لایــق بــوون بــبن بــە ئوممــەت
بــۆ پێغــەمبــەری عــالی بــە هیممــەت
مــادام خاتــەم بــوو بــۆ پێغــەمبــەران
ئیمامــەی ڕســتەی هــەمــوو ڕەهبــەران
ئوممــەت قیمــەتی بــە پایــەی شــاهە
شـــاهم شـــاهێکە جیهـــان پـــەناهـــە
شــاهم شــاهێ بــوو فــەردی جیهــان بــوو
سینەی خەزێنـەی گـەنجی پـەنهـان بـوو
جیلـوەی وجـوودی لـە (فـوق العرشـــ)ـــا
نـووری ئـەبـاران بـە شـانی فـەرشـا
خـودا گـەلێکـی بـۆ نـارد لـە یـاران
خـــاوەن پایـــە بـــوون بـــۆ ڕۆژگـــاران
لـە چـەنـد ئـەسـفارا، دەرچـوو سـەنایـان
سـیفری ئــەشــعیا، باسـی سـەفایـان
ڕەحمـەت بـە وێنـەی بـارانی بـەهـار
ئـەبـارێ بۆیـان، بـە لـەیـل و نـەهـار
تــاوێ پـــڕتاوی ڕەحمـــەتی خـــودا
کاتـێ بـە خـوڕڕەم ئـەهـات لـە سـەردا
ئـــەیـــشۆرینەوە لـــە تـــۆز و کـــەدەر
ئـەبـوون بـە مینـای بـێگـەردی ئـەنـوەر
دڵـیان پـاک ئـەبـوو وێنـەی ئاوێنـە
بـۆ خـەڵـقی ڕەهبـەر ئـەبـوون بـە وێنـە

خەوش و خاڵ نەما لە خانەی دڵیان
بووبوو بە (ئەثیر) سەراسەر گڵیان
ناوی هەناو و دڵیان ئاوابوو
دنیای دووهەمیان لە بەرچاوا بوو
هەر بە بێداری لە سەر پشتەوە
خەویان ئەبینی بە بەهەشتەوە
بێ‌ئەدەب هاتم بە سەر قەتارا
ئیستغفار ئەکەم لەم چەند وتارا
ئەتوانم بڵێم (فنا فی الله) بوون
لە ماڵی دنیا بێ‌موباڵا بوون
مەستی شەربەتی لیقای خودا بوون
سەربەستی دەرگای فەنا و بەقا بوون
بە سۆلی سووکی بێ بەند و قەیتان
سەرەڕێیان گرت لە سوپای شەیتان
بە کەوانی کۆن تیریان ئەتەقان
شەیتان ڕای‌ئەکرد بۆ بانی مەقان[٤]
یانی بە هێزی ئیمان و باوەڕ
بڕییان کلکی ئەهلی کوفر و شەڕ
بۆ سەمای جیهان بووبوون بە نوجووم
بۆ شانی شەیتان بووبوون بە (رجوم)
بۆیە لە هەر کوێ عومەر دەرئەکەوت
شەیتان ئەلەرزی و بەلادا ئەکەوت

٤. مەقان: موغان: واتە بانی موغان، موغان: موغەکان: سەرەکی ڕۆحی ئاگرپەرستەکان.

لـە ڕۆم و عـەجـەم لـە قیبت و بـەربـەر
سـوپای کافریـان هـەمـوو دایـە بـەر
ئـەتـووت شـوانن لـە سـەر ڕانی جـاف
گـورگ ئـەفـڕێنن ئـەتـراف بـە ئـەتـراف
تـەختـەی بـێگیـای سـەراسـەر زەوی
لـە نـەرم و زبـران لـە بـەرز و نـەوی
بـوو بـە گولوسـتان بـۆ ئـادەمیـزاد
بـوو بـە بێـستانی ئینـسانی ئـازاد
شـاهم شـاهێ بـوو لـە جیهانـا فـەرد
مـەرهـەم بـوو بـۆ زام، شـیفا بـوو بـۆ دەرد
سینەی گەنجینـەی (لـوح المحفـوظ) بـوو
گـەلـێ ئـەسـراری تێـدا مـەلحـووز بـوو
چـرای (ثریـا)ی عالـەم بـوو یـەکـسەر
خەیـری گـشتی بـوو، بـۆ پـەری و بـەشـەر
گـەردن سـوراحی بلـووری بـێگـەرد
نیگـای شـیفا بـوو بـۆ گـیرۆدەی دەرد
ئـەگـەر بـە ڕەحمـەت لا بکاتـەوە
پـەردە لـە سـیمای لا بداتـەوە
تـاوی هـەتـاوی ڕوخـساری پـاکی
ڕۆژی ڕوونـاکی عـەرز و ئـەفلاکـی
جیلـوەی تـەجـەلـلای نـووری خـودا بـوو
چـرای چـلچـرای فـەیـزی (هـدی) بـوو
جیلـوەی بدایـە بـۆ هـەر کـەس بـە نـوور
سینەی بۆ ئـەبـوو، بـە سـینای کـۆی تـوور

بۆیـە قـودوومی بـە خـەیـر و تـەمکـین
بـوو بـە هـۆی ڕەحمـەت (علـی العـالمین)
مـۆمی ڕۆخـساری، کاتـێ هـەڵگیرسـا
لـە سـەر ئافـاق و لـە سـەر ئـەنفوسـا
دڵـــی دڵـــداران بـــوو بـــە دێوانـــە
خۆیـان ئـەسـووتان وێنـەی پـەروانـە
بۆیـــە فیـــدایی هاتنـــە دەرەوە
شـــیعاری مـــردن بـــەڕاســـەرەوە
شـوهەدای بـەدرت ئـەی بـەدری تابـان
بـۆ سـەری تـۆ بـوون بـە قـۆچی قوربـان
تـۆ بـەدری فـەلـەک ئـەوان هالـە بـوون
تـۆ بابـە و ئـەوان وەک نـەوسـالە بـوون
ڕۆژی ڕوخـسارت هـەڵـهات لـە ئافـاق
ئافـاقی پـڕ کـرد لـە نـووری ئـەخـلاق
شـوهەدای ئوحـود ئـەحـەد پـەرسـتان
بـە دەسـتی زومـرەی تـەبیعـەت پـەسـتان
کۆمـەڵ بـوون لـە دەور مـانگی ڕوخـسارت
سێبەر بـوون لـە سـەر جـەبهـەی نـازدارت
حـەمـزە ڕەمـزێ بـوو بـۆ فیـداکاری
مـەسعـەب شـێرێک بـوو بـۆ مـەیدانـداری
نـەزری کـوڕ ئـەنـەس فیـداکارت بـوو
لـە حـەفتـا بـرین برینـدارت بـوو

خاریقـەی خـەنـدەق خـەڵاتی حـەق بـوو
بـە سـوپای (صـبا) حـەق مـووەففـەق بـوو
بـە شـەهـادەتی سـەعـد کـوڕی مـەعـاز
فریـشتەی فـەلـەک هـاتن بـە پـەرواز
بـۆ ئیـستیقبالی نـازڵ بـوون مـەلـەک
ڕۆحیـان وەرگـرت بـۆ ئـەوجـی فـەلـەک
مـن بم بـە فیـدای خـۆت و یارانـت
یـارانی بـۆ حـەق فیـداکارانت
باغێکـت دانـا لـە لـە گـوڵ و گوڵـباخ
عالـەمـی پـڕ کـرد لـە عـەتـری دەمـاخ
پێ لە سەر عەرزا و سەر لـە سـەر فـەلـەک
بـە دەوری سـەرتـا ئـەگـەڕان مـەلـەک
سـەر زەوی گـۆڕا بـە بـاغ و بێـستان
پـڕ بـوو لـە لیمـۆ بـۆ دەسـتی دۆسـتان
وەنـەوشـە و نیرگـز گوڵـباخ و نـەسـرین
بـۆی حـەیـران ئـەبـوون هـەزاران شـیرین
بـرا بێنـە سـەیـر کـاتی سـەیرانـە
لـە بـۆی ڕەیحانـە دڵـم حـەیرانـە
دنیـا بـەهـەشـتە و گـوڵ و گوڵـزارە
نـووری ڕەهبـەر و یـاران دیـارە
ڕۆح فیـدای ڕەشـحەی لێـوی نـازدارت
شـیفا و دەرمـانی دەرد و ئـازارت
(نـامی) نمێکـی بـەسـە لـەو لێـوە
یـا نـیمنیگایـەک بـەو چـارە و شـێوە

شـــاهم شـــاهێکە فـــەردی جیهانـــە
یـەک نیگـای شـیفای دەردی پـەنهانـە
شـــەهیـــدەکـــانی ڕەزمگـــای ڕەزمـــت
شـیر وەشـێنانی دڵ پــڕ لــە عــەزمـت
ئـەوان بـوون بـە هـۆی ئـاوایی جیهـان
بـــۆ ئـــاوەدانی بـــۆ دونیـــای وێـــران
خـوێنی ئـەوان بـوو بـە ئـاوی حـەیـات
دەرچـوو لـە چـەشمـەی تـاریکی زولـمات
بـوو بـە فـوراتی حـەدیقـەی ئینسان
بـوون بـە ئـاودێری حـەقیقـەی ئیحـسان
یـا دیجلـەی پـڕئاو کـە بـۆ عـەدل و داد
سەیحوون و جەیحـوون بـۆ عـیلم و ئیرشـاد
ڕوانـــدی داری پـــڕ ســـایە و ســـێبەر
بـۆ گـوڵ بـۆ گـەڵا بـۆ سـایە و سـەمـەر
بـوو بـە قـووتی ڕۆح، بـۆ جاهـ و پایـە
بـوو بـە هـۆی فوتـووح، بـۆ مـەعنـا و مایـە
تـــا جیهـــانێکی تـــازەی پێگـــەیانـــد
داری شـــوعووری لـــە دڵـــدا ڕوانـــد
چـەن چـین پـێگـەیشت مـەردانی نـامی
بـوون بـە خـادیمی دیـنی ئیـسلامی
یەکەم چین ئەسحاب بە قـەدر و تـەمکـین
دووەم چـینی بـەرز گـەلی تـابیعین
ســێهەم تــابیعی زومــرەی تــابیعین
(رضـــوان الله عـــنهم أجمعـــين)

لەم دوو چینـە بـوون گـشت (مجتهـدین)
(مــدون) لـەبـۆ حـوکمی شـەرع و دیــن
بـەمـان ڕەسـا بـوو ئـەحکـامی ئیـسلام
کیتــاب و ســوننەت لـەبـۆ خـاس و عـام
بـــاوەڕم وایـــە حـــوببی ئـــەمانـــە
مایــەی نــەجاحــە و فــەرعــی ئیمانــە
شـــیعاری ئیـــسلام حـــوببی خودایـــە
لـــە پـــاش ئـــەو حـــوببی رســـول الله
سـێهەمـین حـوببی جـەمیعـی ئـەسحاب
خادیمــانی حــەق بــۆ نــەشــری کیتــاب
چـوارەمـین حـوببی گـشت (مجتهـدین)
پێنجــەم ئـەولیـای بـە قـەدر و تـەمکـین
ئەم پێنج خەسڵەتـە بـۆ هـەر کـەسێ بێ
ئــەبــێ زاتی حــەق فریــادڕەســی بــێ
تانـــە لـــەمانـــە تانـــە لـــە چـــاوە
ئینـــسانی بــێچـــاو ســـەر لــێشـــێواوە
خودایـــا لـــە ســـەر حـــوببی ئـــەمانـــە
پایـــەدارمـــان کـــە لـــە ڕووی زەمانـــە
حاجـەتمـان نییـە بـۆ سـەنـای ئـەسحاب
بـە غـەیـری (نـص)ی سـوننەت و کیتـاب
بۆ سەنای عومـووم یـا سـەنـای خوسـووس
فـــەرائیـــد زۆرن لـــە دەریـــای نوســـووس
ئایـــەتی (کنـــــتم خیـــــر امـــــە)
کافییـــە ئــەگـــەر خـــاوەن هیممـــەتی

خیتـــابی خـــودا لـــەگـــەڵ ئـــەوان بـــوو
هەر جەمعی ئەسحاب لـە بـەر چـاوان بـوو
ئایـــەی ئـــاخری فـــەتحـــی موکـــەڕڕەم
باســـی ئـــەســـحابی حـــەزرەتـــە ســـەرجـــەم
بـــــــلێ (محمـــــــــد رســـــــــول الله)
تێفکـــــره بـــــه دڵ ئـــــەگـــــەر ئاگـــــاهی
وەســـــفی (اشـــــداء) (علـــــی الکفـــــار)
بـــۆ ســـەنـــای ئـــەوان فـــەرموویـــە بـــاری
وه (رحمــــــاء بیـــــــنهم) عـــــــەیــــــان
خوڵـــکی ئـــەوانـــت بـــۆ ئـــەکـــا بـــەیـــان
(رحمـــاء) بـــه دڵ بـــه ڕۆح و بـــه گیـــان
لـــەبـــۆ خـــزم و خـــوێش بـــۆ بێگانـــەکـــان
ڕســـــتەی (تـــــراهم رکعـــــا) تـــــەمـــــام
بـــۆ باســـی نـــوێژی ئـــەوانـــه بـــه عـــام
وه (یبتغـــــــون فـــــــضلا مـــــــن الله)
باســــــی ئیخلاســــــه بــــــۆ زاتی خــــــودا
مــــادام تــــالیبن بــــۆ بــــەهــــرەی ڕیــــزوان
خـــوا عـــەتـــای ئـــەکـــا بـــه هـــەمـــوو ئـــەوان
ڕســـــتەی (ســـــیماهم فـــــی وجـــــوههم)
(خـــــــتم الالـــــــه لتـــــــوجیههم)
مـــــادام ئاســـــاری کـــــاری ســـــوجووده
دوژمـــــنی ئـــــەوان وێنـــــەی یـــــەهـــــووده
بـــۆ ســـەنـــای ئـــەوان ئـــەبـــێ بـــه دەلیـــل
نـــەســـسی قورئـــان و تـــەورات و ئینجیـــل

بــۆ ســـابیقینی هیجــرەت و نــەســرەت
ئــاخری تــەوبــە بکــە بــە حوججــەت
شــامیلی حاڵــە بۆیــان ئــەجمــەعــین
هــــەروا شــــامیلە لــــەبــــۆ تــــابیعین
(رضـــــی اللە عـــــنهم و رضـــــوا)
مــەیــدان نایــەڵــێ لــەبــۆ یــەک و دوو
لــەبــۆ ئــەســحابی (بیعــە الرضــوان)
ڕەزای ئــیعلان کــرد خــودا بــۆ ئــەوان
پــاش ڕەزای خــودا شــەخــسی نــاڕەزا
یــەقــین نامــەردە بــە حــوکمی قــەزا
بــاوەڕت وابــێ حــوببی ئــەمانــە
ڕوکــنی ســابیتی دیــن و ئیمانــە
ئیمــان واجبــە بــە نــەســسی قورئــان
نــەســسی قورئــانیش مــەدحــە بــۆ ئــەوان
بــەرەو ژوور بــڕۆ چــون ســەربــەرەوخــوار
جێــی مــڵشــکانە بــۆ هــەزار هــەزار
لادان لــە قورئــان لادانــە لــە دیــن
مــەیلــە بــۆ هــەوای شــەیتــانی لــەعــین
بــرا وەربگــرن لــە مــن واتــەی ڕاس
ڕوو بکــەن لــە حــەق بــە شێوەی ئــیخلاس
لــە ســەر ئــەساســی ســیرەتی حــەزرەت
وا دامــەزراوە قــەراری ئوممــەت
ئــەســحابی حــەزرەت هــەمــوو عــودوولن
بــۆ ڕەزای خــودا هــەمــوو مــەشمــوولن

جا لە بەر هەوای بیدعەت و خیلاف
وا دامەزراوە لای ئەهلی ئینساف
خولەفای حەزرەت لە ڕووی ئەییاما
ئەشرەفی خەلقن لە ناو ئیسلاما
ڕێزی ئەوانیش بە سەد لەتافەت
دامەزرا لە سەر ڕیزی خیلافەت
بووبەکر و عومەر عوسمان و حەیدەر
لە پاش ئەمانە بە موژدەی ڕەهبەر
باقی عەشەرەی موبەششەرەی وا
موژدەیان وەرگرت لە دەستی خودا
ئەسحابی بەدر و ئوحودی جوان
هەروا ئەسحابی (بیعە الرضوان)
عەبباس و حەمزە لەگەڵ حەسەنەین
ڕەیحانەکانی (سید الکونین)
باقی ئەوانەی نەسیان لە دەستە
لە حەزرەتەوە بۆ ئەم مەبەستە
هیچ خیلاف نییە لای ئەهلی ئینساف
لەمانە وتمان بۆ برای دڵساف
جا بەم تەرتیبە ئەڕۆین بە ڕێدا
هەتاکوو دڵمان ئەژی لە جێدا
ئەڵێم بووبەکر (شیخ الاصحاب)ە
بۆ بارانی نوور وێنەی سەحابە
ئەو ئەبووبەکرە لە ناو مەردانا
یەکە موئمین بوو لە ڕووی جیهانا

ئـەو ئـەبووبـەکـرە، کـە خـاوەن دڵ بـوو
(صـدیق)ی هـەمـوو کـاری موشـکڵ بـوو
ئـەو ئـەبووبـەکـرە بـە هێـزی ئـیخلاس
ڕێـزی ئـەگـیرا لـە لای عـام و خـاس
ئـەو ئـەبووبـەکـرە بـە هـەمـوو بـارا
لـەگـەڵ حـەزرەت بـوو لـە ڕۆژگـارا
ئـەو ئـەبووبـەکـرە دڵـی ئـەبـرژا
چـاوی فرمێـسکی سـوێری ئـەڕێـژا
تـەسـدیقی ئـەکـرد چـی ئـەهاتـە نـاو
هـەر وەک ببینـێ ئـەو شـتە بـە چـاو
چ لـە سـەرزەوی یـا لـە ئاسمانـا
یـا لـە ڕووداوی چـەرخـی زەمانـا
هـەرچـی ئـەفـەرمـوو حـەزرەتی ئـەنـوەر
تـەسـدیقی ئـەکـرد سـدیقی ئـەکبـەر
بـە حـاڵ و بـە مـاڵ، دارایـی هـەمـوو
بـە قـەدەر پێویـست ئامـادە بـوو زوو
قورئـانی ئـەخوێنـد بـە دەنگێکـی وا
ئـەیهێنـا بـۆ حـەق کـەللەی پڕهـەوا
کـافران بـە ڕۆح بـوون بـە دوژمـنی
لـە بـەر کـەرامـەی سـیما و دیمـەنی
ئـەو ئـەبووبـەکـرە موریـد بـوو بـە دڵ
بـۆ وەرگـرتنی سـیرەتی کـامڵ
هـەتـا لـە دڵـیا دامـەزرا بـە حـەق
نـووری سـدیقی بـە وێنـەی شـەفـەق

بۆیـــە وا خـــودا، کـــردی بـــە جێـــدار
جێـــداری یـــەکـــەم، بـــۆ شـــاهی موختـــار
ئـــەو ئـــەبووبـــەکـــرە شـــاهی بـــردەوە
چـــەن شـــەو لـــە مـــاڵا ئـــەوی شـــاردەوە
جـــا (مختفـــی) بـــوون لـــە غـــاری ســـەورا
موشـــریکەکـــانیش گـــەڕان بـــە دەورا
کـــاتی گـــەیـــشتن بـــە لای دەرگـــای غـــار
ســـدیق غـــەم دایگـــرت لـــە شـــەڕی کوففـــار
لـــە ویـــدا فـــەرمـــووی شـــاهی ئومـــەنـــا
(لا تحـــــــــزن ان الله معنـــــــــا)
هـــەتـــا ڕێکـــەوتـــن بـــۆ کـــۆچی دڵـــسۆز
بـــۆ پێـــکـــهـــاتنی چـــەرخێکـــی پـــیرۆز
ماڵـــی بـــەجـــێهێـــشت لـــە بـــەر ئـــەم دینـــە
لـــەگـــەڵ حـــەزرەتـــا چـــوو بـــۆ مـــەدینـــە
جـــا یـــەکـــە یـــەکـــە و دوو دوو و ســـێ ســـێ
یـــاران کۆچیـــان کـــرد بـــە هـــەر چۆنـــێ بـــێ
(والـــــــسابقون الاولـــــــون) هـــــــات
بـــۆ کـــۆچی گـــەلی خـــاوەن بـــەرەکـــات
بـــۆ موهـــاجیرین هـــەم لـــەبـــۆ ئـــەنـــسار
(رضـــــی عـــــنهم الغفـــــار الـــــستار)
ئـــەنـــسار لـــە هـــەمـــوو ئـــەهلـــی عـــەقـــەبـــات
گـــەیـــشتنە ســـەر لووتکـــەی دەرەجـــات
موهـــاجیرین و ئـــەنـــساری ســـابیق
لـــە پایـــەی دینـــا فـــایقن فـــایق

هیچ کەس ناگا بە پایەی ئەوان
ئەگەر تێبگەن لە مانای قورئان
ئەو ئەبووبەکرە لە ماوەی ژینا
خاوەن جیهاد بوو لە ڕێگەی دینا
لە غەزاکانی ئازا و ئامادە
ئەچوو بە وێنەی سوپاهی سادە
کاتێ نەخۆش کەوت سەروەری ئەنام
سدیقی دانا کردی بە ئیمام
یانی ئیمامە بۆ ئەهلی ئیسلام
سدیق بە ئەمری (سید الأنام)
یەکێ کە حەزرەت بیکا بە ئیمام
کەس عەزلی ناکا بە توولی ئەییام
جا کاتێ حەزرەت وەفاتی فەرموو
بوو بە جێنشین سدیق زووبەزوو
دامەزرا ئەووەڵ بە ئەکسەرییەت
پاشان هاتە جێ ئیجماعی ئوممەت
بە قەتعی نەما لەو کارە خیلاف
ئیتر گوێ مەدەن بە واتەی گەزاف
کاتێ بووبەکر بوو بە خەلیفە
بوو بە ناسیری میللەی حەنیفە
گەلێ کاری کرد بۆ نەسری ئیسلام
هەموو مەعلوومن لە مێژووی ئەییام
یەکەم بووبەکر ڕۆیشتە مەیدان
نەرمی کرد کەللەی گشت موعانیدان

ملیـــان ڕاکێـــشا بـــۆ ئـــەدای واجیـــب
بچـــووک و گـــەورەی خـــاوەن مـــەراتیـــب
گـــشتی ڕام کـــردن ئـــەعـــرابی عاســـی
ئامـــادەی کـــردن بـــۆ ڕێـــی حـــەق ناســـی
دووەم بە ســوپای بــێهــەمتــای ئــەسحاب
موسەیلەمەی کوشـت دەرچـوو لـە حیـساب
فیتنەی ئەم گورگـە فیتنـەی عـەمیـا بـوو
دونیـــا بـــە جـــارێ وێنـــەی دەریـــا بـــوو
بـــەلام بـــە ڕەحمـــی (خـــالق الـــسماء)
زوو کوژایـــــەوە و ئاســـــاری نـــــەمـــــا
لـە پـاش ئـەو حـەربـە بـیری کـردەوە
هـــەمـــوو قورئـــانی جـــەمـــع کـــردەوە
ســوورەت بـە ســوورەت ئایـەت بـە ئایـەت
لـــە ئـــەووەڵـــەوە هـــەتـــا نیهایـــەت
نـــەکـــا ئایـــەتـــێ ون بـــێ لـــە قورئـــان
ببـــێ بـــە مایـــەی زیـــانی ئیمـــان
ماوەی (خلافـە)ی کـەمتـر لـە سێ ساڵ
لـەو مـاوە کـەمـە دیـن چـوو بـۆ کـەماڵ
گـەلـێ کـاری کـرد لـە کـاری بـەسـوود
بۆ دیـنی ئیـسلام (موصـل) بـە مـەقسوود
کاتێ نـەخـۆش کـەوت نـەخۆشـی وەفـات
خدمـــەتێکـــی کـــرد پـــڕ لـــە بـــەرەکـــات
لـــەبـــۆ یارمـــەتی ئیـــسلامی ئـــەنـــوەر
خیلافـــەتنامـــەی نووســـی بـــۆ عومـــەر

ئــەیــزانی عومـــەر خـــاوەن هــەیبــەتــە
لـــــە ئیـــــدارەدا خـــــاوەن حیکمـــــەتـــــە
ئەسحابیش هـەمـوو بـەیعـەتیـان پـێکـرد
بـەبـێ مـاتڵ بـوون زۆر بـە دەســتوبـرد
جـــا هاتـــە مـــەیـــدان عومـــەری عـــادڵ
ئـــەشـــقیا شـــکێن مـــەهـــیبی کـــامڵ
ئـەوەی ئـەو کـردی بـە مـاوەی دە سـاڵ
بـۆ کـەس نـەدەکـرا بـۆ وادەی سـەد سـاڵ
عومــەر بــوو بــە حــەق بــە یــاری خــودا
دیــنی دامـــەزرانـــد بــێهــەرا و غــەوغــا
فــەتحــی جــەزیــرەی عــەرەبی بــەو بــوو
بــەو بــوو کــە دنیــا خــاوەن پرتــەو بــوو
فوتــووحی شــام و عــەرزی فــەلــەســتین
بــە هێــزی ئــەو بــوو بــۆ دیــنی مــەتــین
ئــەو بــوو دایمــەزرانــد یاســا لــە عــەســرا
فـــەرمانـــڕەوا بـــوو لـــە موڵـــکی میـــسرا
عومـــەر بـــوو گـــرتی وڵاتی ئـــەهـــواز
عومـــەر فـــاتیح بـــوو بـــۆ موڵـــکی شـــیراز
عومـــەر فـــاتیح بـــوو لـــەبـــۆ کوردوســـتان
عومـــەر فـــاتیح بـــوو لـــەبـــۆ لوڕســـتان
عومـــەر ســـەراســـەر ئێـــرانی داگـــرت
ئـــاگری مـــەجووســـی لـــە نـــاوا لابـــرد
عومـــەر بـــوو بـــە حـــەق لـــە ڕێـــی خـــودادا
دیـــنی دامـــەزرانـــد لـــە ڕووی دونیـــادا

گــــەلـــێ ئوســـوولی ئیـــدارەی دانـــا
بـــوو بــە مایــەی خــەیــر لــە ڕووی جیهانــا
حـــەزرەتی عـــەلی (مـــصاهره)ی کـــرد
(ام‌کلثـــــوم)ی لـــــەبــــۆ مــــارە کــــرد
بۆیــە بــەدخواهــان لــەمســەر و لــەوســەر
دوژمـــــنن لـــــەبـــۆ حـــەزرەتی عومـــــەر
کە شەهیـد کـرا شــەخـسی مــەخـسووسی
بــە دەســـتی (ابولؤلـــؤ)ی مـــەجووســـی
خـــەلافـــەتی کـــرد بـــە شـــێوەی شـــوورا
لــە نــاو شــەش کــەســی عــالی شــوعوورا
عوسمان و عـەلی هـەم تـەلحـە و زوبـەیـر
عبـــدالرحمن و ســـەعـــدی خـــاوەن خێـــر
لــە پــاش مــەشــوەرەت عوسمانیــان دانــا
بـــوو بـــە خـــەلیفـــە لـــە ڕووی جیهانـــا
گــەلــێ کــاری کــرد عوسمــان لــە ژینــا
لـــە ڕێـــی تـــەرویجـــی ئیـــسلام و دینـــا
چـــەن خدمـــەتی کـــرد بـــە زاتی ڕەهبـــەر
چـەنـدێ بـۆ دیـنی خـۆی خـسته خـەتـەر
هــەر لــە بــەر چــارەی کوففــاری ڕووڕەش
دووجار کـۆچی کـرد بـۆ مـولکی حـەبـەش
بـۆ جــاری ســێهەم لــە ڕێــی ئــەم دینــە
هاتـــەوە لـــەبـــۆ شـــاری مـــەدینـــە
بــیری ڕۆمــەی ســەنــد بــە هــەزار دینــار
بـــۆ ئاسایـــشی ئـــەســـحابی ئـــەبـــرار

هەم (جیش العسرە)ی بەڕێ خست بە ماڵ
لــە کــاتی قــاتی و ساڵــی وشــکەســاڵ
بۆیــە فــەرموویــە (ســـید)ی جیهــان
دووجــار بــەهــەشــتی کــڕیوە عوسمــان
لــەوانــە چــاتر جــەمعــی قورئــان بــوو
کــە هــۆی مانــەوەی دیــن و ئیمــان بــوو
لــە سـەر ئیجمــاعی سـەحابــە سـەرجـەم
گردیــان کــردەوە قورئــانی ئــەعــزەم
بە لەهجەی قوڕەیش شەش نوسخەی نووسی
یــەکێ لــە لای خــۆی، مــا بــە خوسووســی
بــاقی بــۆ مــەککــە و بــۆ میــسر و بــۆ شــام
لــەبــۆ بــەحــرەیــن و بــۆ کووفــە تــەمــام
وێنــەی ئــەم کــارە نــەکــرا لــە دونیــا
ئــەگــەرنــا دونیــا ئــەبــوو بــە دەریــا
هەر کەســێ لــە ســەر شــێوەی خوسووســی
قورئــانی بــۆ خــۆی بــە دەس ئــەنووســی
بێجگــە لــەوانــە حــەزرەتی مــەعــسووم
دوو کچــی پێــدا بــە یاســای مــەرســووم
یــەکــەم ڕوقــەییــە پــاش وەفــاتی ئــەو
(امکلثـــــوم)ی پـــــڕنوور پرتـــــەو
پــاش شــەهــادەتی عوسمــانی نــازدار
بــوو بــە خــەلیفــە حــەیــدەری کــەڕڕار
لــە ســەر قــەراری ئــەســحابی کــیرام
بــوو بــە خــەلیفــە بــۆ گــەلی ئیــسلام

عـەلی سـەرچـاوەی نـووری تـەقـوا بـوو
نـەشـئەتی لـە سـەر دیـنی هـودا بـوو
هـەر بـە منالـی قوتـابی شـا بـوو
عـەلی حـەبـیبی (رسـول الله) بـوو
عـەلی خـاوەنی بـەهـرەی عـەتـا بـوو
قـائیلی (ولـو کـشف الغطـا) بـوو[٥]
عـەلی هاوسـەری وەردەی زەهـرا بـوو
عـەلی جـەلیـسی خـاوەن ئیـسرا بـوو
کـەمـال و فـەزلی حـەزرەتی عـەلی
دەلیلـی نـاویَ وازیحـە و جـەلی
بـابی مـەدینـەی عیلمـی سـەروەر بـوو
لـە بـابی دونیـا زۆر باخـەبـەر بـوو
عـەسـری خولـەفـای بـەرزی (راشـدین)
(عـصر الـذهب) بـوو بـۆ دنیـا و بـۆ دیـن
خیلافـیَ نـەبـوو لـە جـەزری دینـا
هـەمـوو ئـەڕۆیـین بـە ڕێـی یـەقینـا
هەرگیـز گـویَ مـەگـرە بـۆ باسـی خـیلاف
هـەرگیـز لامـەدەن لـە ڕیگـەی ئینـساف
ئـەوەی کـە خـیلاف ئـێنی بـە نـاوا
گرییـە بـۆ دڵ، تانـە لـە چـاوا
شەش مانگ لە ماوە و مـوددەی خیلافـەت

٥. مەبەس ئەو وتەی حەزرەتی عەلییەیە، کە فەرموویەتی «ما زدت یقینا بربی ولو کشف الغطاء» واتە: ئەگەر پەردەش لە نێوانا هەڵگیریَ و خوا بە چاوی خۆم ببینم باوەڕم لەوەی ئیستا هەمە زیاتر نابیَ.

لـەبـۆ حـەسـەن بـوو لـەگـەڵ لـەتافـەت
حـەسـەن و حوسـەیـن جووتـە بـرا بـوون
لــەبــۆ خانــەدان گــەورە چــرا بــوون
ڕەیحانــەکــانی باغچــەی ڕیــساڵەت
شــیفا بــوون لــەبــۆ دەرد و مــەلالــەت
نــەوغونچــەی بــاغی گوڵــناری شــاهی
پــەروەردە شــنۆی ســەفــای ئیلاهــی
دڵپەرداخ بە بـۆی زەهـرای بـە عیـسمەت
زاویــەی قائیمــەی شــەکلـی ڕیــساڵەت
خۆشــەویــستانی حــەزرەتی ڕەهبــەر
نــووری دوو دیــدەی بینــای پێغــەمبــەر
ئــەمجــار (محمــد) کــوری حــەنیفــە
لــە عیلمــی دینــا گــەلــێ شــەریفــە
زانــاترینی تــەبــەقــەی ســەلــەف
دوای (ابــن عبــاس) ئـەعلـەم و ئـەشـرەف
ئیتــر وازبێــنن لــە تــیری تــەقــدیر
ئـەبـڕێ هـەزاران لـە ڕشـتەی تـەدبـیر
موقــەددەراتی چــەرخــی کائینــات
لــە ئاسمانــەوە دێتــە ســەر بــسات
ئێمــە نــەزەرمــان بــۆ یاســای دینــە
لــە ســەر پــەیــڕەوی (علــم الیقــین)ە
نــەتــەوەی پــاکی حــەزرەتی عــەلی
گــەلێکــی تیــابوو ئینــسانی وەلی

بـــوون بـــە ئـــەســـتێرە بـــۆ بـــەرەی زەوی
دونیایـــــان داگـــــرت بـــــڵەنـــــد و نـــــەوی
یـاران بـەرابـەر بـە هـەمـوو ئـەسـحاب!
هـەرگیـز لامـەدەن لـە نـەسـی کیتـاب
بـــەوان دامـــەزرا، بناغـــەی ئیـــسلام
لـە سـەر ئـەو ئـەسـڵە دامـەزرا ئـەحکـام
ئـەوان نووسـەر بـوون بـۆ هـەمـوو قورئـان
ئـەوان (حـافظ) بـوون بـۆ ئایـەتـەکـان
کیتـاب و سـوننەت بـە بـەرزی شـیمە
لـــەوانـــەوە هـــات گـــەیـــشتە ئێمـــە
ئـەوان تـەفـسیریان وەرگـرت لـە ڕەهبـەر
ئـەوان بـۆ ئێمـە بـوون بـە سـەردەفتـەر
هـــەروا ســـوننەتی ڕەهبـــەری ئـــەمـــین
لـەوانـەوە هـات لـەبـۆ ئـەهلـی دیـن
یـــانی وتـــار و ڕەفتـــاری حـــەزرەت
یـاخود تـەقریـرێ ببـێ بـە حوججـەت
بـەوان گـەیـشتە چـینی دووهـەمـین
(رضـــــی الله عـــــنهم اجمعـــــین)
ئـەگـەر ئـەوانـە بـێعـەداڵـەت بـن
یـا ئـەهلـی بیدعـەت یـا زەلالـەت بـن
لـە دەسـتی پـەسـتی بـەدکـردارەوە
چـۆن شـت بـە پـاکی دێتـە خـوارەوە
ئـاوی سـەرچـاوە بـە جۆگـەی ناپـاک
چـۆن ئـەخۆرێتـەوە و ئـەبـێ بـە خـۆراک

(والحــق) ئــەحکــامی دیــنی موسوڵــمان
لــەوانــەوە هــات گــەیــشتووە پێمــان
بــارانی ڕەحمــەت لــە ســەریــان بــارێ
وەک فـەسڵی بـەهـار کـە دێتـە خـوارێ
جـا وەکـوو ئـەسـحاب بـە پـاک ئـەزانـن
قـــەدری تـــابیعین ئـــەبـــێ بـــزانن
کـەس پایـەی ناگـا، بـە پایـەی ئـەسحاب
چونکــە بــەڕێــزن، بــە نــەســی کیتــاب[٦]
هــەروا ئــەوســەتــن لــەو ســێ قــەرنانــە
بــە خـــەیـــری دانـــان شـــاهی زەمانـــە
(خیـــر القـــرون قرنـــی) بـــە پرتـــەو
دوو (ثـــم) هـــەیـــە عـــاتف لـــە پـــاش ئـــەو[٧]
قـــەرنی تـــابیعین خـــادیمی دیـــن بـــوو
قـــەرنی ئـــەئیممـــەی (مجتهـــدین) بـــوو
ئـــەبووحـــەنیفـــە ئیمـــامی ئـــەووەڵ
لــە ســەر قــەرنی دوو هــاتووە موکــەممــەل
مالیــک، شــافیعی ئــەحمــەدی حــەنبــەل
ئیمـــامی دیـــنن ئـــەکمـــەل و ئـــەفـــزەل

٦. مەبەس لەو ئایەتە پیرۆزەیە کە ڕێزی (تابعین) دەرئەخا وەکوو خوای گەورە لە سوورەتی تەوبەدا لە ئایەتی (١٠٠)دا ئەفەرموێ: (**والسابقون الأولون من المهاجرين و الانصار والذين اتبعوهم باحسان رضى الله عنهم و رضوا عنه. واعد لهم جنات تجرى تحتها الانهار خالدين فيها ابدا، ذلك الفوز العظيم**).

٧. حدیسەکە ئەفەرموێ: (**خير القرون قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم**)

باقی ئیمامان ئەهلی ئیجتیهاد
ئەسحابی عیلم و فەزیلەی ئیرشاد
بوون بە جۆگەی دین،بۆ دەریای ئیسلام
ئیسلامیان گەیاند بە خاس و بە عام
بەوان تەحقیق بوو کیتاب و سوننەت
بەوان ڕووناک بوو یاسای شەریعەت
ئەگەر ئوستادێ نەبێ بۆ (تلمیذ)
ناگاتە پایەی عالمی عەزیز
هەروا دەس‌بەدەس شەریعەت کە هات
لە سەر ئوسوول بوو لە ڕووی کائینات
حوقووقیان هەیە لە سەر موسولمان
فەرزە حورمەتیان بۆ خاوەن ئیمان
ئەوان حامی بوون بۆ شەرع و ئەحکام
ئەوان حافز بوون بۆ دینی ئیسلام
هەروا ڕابگرن بە یاسای ئیکرام
قەدری ئەولیا بە فەزڵ و مەقام
(متبع) لەبۆ کیتاب و سوننەت
(مجتنب) لە گشت فەساد و بیدعەت
مەزهەب و دین و ئاینیان هەموو
لە سەر پەیڕەوی (رسول الله) بوو
بە زۆری زیکر و تاعەت و ئەزکار
ڕژا لە سەریان بارانی ئەنوار
هەرکەس کەوتە سەر ئەحواڵی ئەوان
بوون بە بەرقی نوور، بۆ کاتی خۆیان

خــودا لــەو نــووره، بــەشمــان پــێبــدا
بڕۆینـــە ڕیـــزی ئـــەولیـــای خـــودا
نمـــی لـــە دەریـــای لـــوتفی خـــودایی
(کافیـــــە) بۆمـــــان، بـــــۆ ئاشـــــنایی
یـــانی ئـــەولیـــا و ئـــەســـفیای عالـــەم
لە سەر بورجی دیـن هـەڵـیانکـرد عـەلـەم
سـفرەی سـەعـادەت بۆیـان هاتـە خـوار
بـە زیکـری خـودای زانـا بـە ئـەسـرار
لـە سـەر ئـەو سـفرە موسوڵـمانەکـان
حیسسەیان وەرگـرت بـۆ چـەرخـی خۆیـان
زادی ئـــەم ســـفرە گـــەیـــشتە عالـــەم
کەس بـێبـەش نـەبـوو لـە خـوانی کـەرەم
هـــەر پایـــەدار بـــوو هـــەتـــا ئـــەم ڕۆژە
لـــە جێـــی نـــزار و شـــوێنی بـــە ڕۆژە
بـــە ئـــاوی چـــاوی گریـــانی ئـــەوان
بـــە بـــۆی هـــەنـــاوی بوریـــانی ئـــەوان
نمـەکـی تـەمکـین حاسـڵ بـوو بـۆ دڵ
ڕێگـەیـان بـڕی مـەنـزڵ بـە مـەنـزڵ
بۆنی ئەوان بوو کە دای لە دەماخ
سـەراسـەر دونیـای پـڕ کـرد لـە گوڵـباخ
پـڕ لـە وەنـەوشـەی سـورمەیـی نـازدار
لـە نێرگـسی مـەسـت لـە بـاخ و گوڵـزار
نەسیمی بـەهـەشـت کـەوتـە ڕووی دونیـا
بـە حـەق سـەرخـۆش بـوو ئینـسانی وریـا

(نـــامی) نمێکـــی ببـــێ لـــە دڵـــدا
نـــوورێکی هـــەبـــێ، لـــە نـــاو مـــەنزڵـــدا
بـــۆنێکی ببـــێ، بـــە وێنـــەی عـــەنبـــەر
ســـوودێکی ببـــێ، لـــە دنیـــای خـــەتـــەر
هـــەمـــووی لـــە ســـایەی ســـایەدارانـــە
هـــەمـــوو لـــە پایـــەی پایـــەدارانـــە
بـــە کـــورتی ئـــەڵـــێم حـــەزرەتی ئـــەنـــوەر
فـــەخـــری مورســـەلـــین، یـــانی پێغـــەمبـــەر
ســـەرداری بـــەشـــەر (محمـــد أحمـــد)
ئـــەنـــوەری عالـــەم بـــە نـــووری ســـەرمـــەد
ڕۆژی جیهانـــە ئـــەم ســـەر تـــا ئـــەو ســـەر
ڕەحمـــەت بـــوو لـــەبـــۆ عالـــەمـــین یـــەکـــسەر
گـــەلی یـــاران و تـــابیعینی دیـــن
گـــەلی ئـــەئیمـــە لـــە (مجتهـــدین)
گـــەلی (صـــدیقین)، گـــەلی شـــوهەدا
ئـــەولیـــا و عامـــەی (مطیـــع)ی خـــودا
ئـــەستێرەی چـــەرخـــن بـــەڵام بـــە میـــزان
هـــەرکـــام مـــەقـــامی مـــەعلوومـــە بۆیـــان
هـــەمـــوو نـــوورانین بـــە نـــووری ئـــەحمـــەد
ئەحمەدی مەحبـووب بـۆ خـودای سـەمـەد
بـــاوەڕتـــان وابـــێ ئـــەمانـــەن ئینـــسان
نوختـــەی مـــەرکـــەزی دائـــیرەی ئیحـــسان
یـــەکـــی ســـەد ڕۆحـــی ببـــا لـــە جـــەســـەد
ئـــەیکـــرد بـــە فیـــدای حـــەزرەتی ئـــەحمـــەد

هـەمـوو ئـەساسـی عیـزز و شـەرەف بـوون
هەموو گەوهـەری یـەکتـای سـەدەف بـوون
ڕسـتەی جـوانی (اصـحابی نجـوم)[٨]
بـۆ ئـەسـحاب وتـرا بزانـە مـەعلـووم
(الخیـر فـی وفـی أمتـی)
بزانـە ئـەگـەر خـاوەن هیممـەتی
زیـارەتیـان خێـرە زینـدوون یـا مـردوو
دەروونیـان تێـرە لـە زیکـری یـاهوو
زیـارەتیـان خێـرە بـۆ مـەدەدکـاری
دڵنیـشان ئـەکـەن بـۆ بـەختیـاری
خولاسـە زومـرەی دانایـانی دیـن
لـەگـەڵ ئـەولیـای تـەریقـەی مـوبین
ۆڵـەکـەی بـەرزن لـەبـۆ بینـای دیـن
مایەی سەربـەرزیـن بـۆ ئـەهلـی تـەمکـین
واقیـع ئـەمـەیـە کـە دیـنی ئیـسلام
لـە سـەر کیتابـە و سـوننەتی ئیمـام
مـەعنـای ئـەمانـە زاهـیرە بـۆ عـام
ئـەیـزانن بـە حـەق عولـەمـای ئـەعـلام
بـەڵام تـەتبیقـی بـە یاسـای ڕەسـوول
ئـەبـێ بـە کلیـل بـۆ دەرگـای وسـوول
یـانی بـەو جـۆرە، کـە مـەولای ڕەهبـەر
بـە جێـی هێنـاوە خاڵـی لـە کـەدەر

---

٨. ئیشارەیە بۆ حەدیسی (اصحابی کالنجوم بایهم اقتدیتم اهتدیتم).

خولـەفـای کـیرام هـەنـدێ لـە یـاران
وا ڕەفتاریـان کـرد لـە مـاوەی ژیـان
بـەو جـۆرە وتمـان سـدیقی ئـەنـوەر
کـەوتـە سـەر نـەهجـی حـەزرەتی ڕەهبـەر
سـەلمـان لـە سـدیق قاسـم لـە سـەلمـان
جـەعفـەر لـە قاسـم گـەیـشتە پـەیمـان
ئـەبوویـەزیـدی بـەسـتامی نـەسـەب
لـە ڕۆحـی جـەعفـەر گـەیـشتە حـەسـەب
هـەروا هاتـە خـوار بـە ڕۆزگـارا
هـەتـا گـەیـشتە پـیری بوخـارا
سەیـد محـەمـەد مـەولای بـەهـرەمـەنـد
مـەشـهووری عالـەم شـاهی نـەقـشەبـەنـد
جـا ئـەو ڕشـتەیـە سیلـسیلەی زێـڕین
هاتـە خـوارەوە بـۆ کـەسـبی تـەمکـین
حـەسـەنی بـەسـری لـە زاتی عـەلی
حەبیـب لـە حـەسـەن گـەییـە تـەجـەللی
داوود لـە حـەبیـب مـەعـرووف لـە داوود
(سـەری) لـە داوود گـەیـشتە مـەقـسوود
جونەید لە (سەری) خاوەن عـیلم و عـەیـن
بـووە بـە (سـید) بـۆ (طـائفتین)
هـەروا هاتـە خـوار عـالیم و عـاریف
بـە نـەهجـی سـوننەت خـاوەن مـەعـاریف
هـەتـا گـەیـشتە قـوتبی ڕەببـانی
شـیخ عـەبـدولقادر غـەوسـی گـەیـلانی

(قـــــدس الله اســـــرار الجميــــــع)
(أن لهـــــم المقـــــام الرفيــــــع)

ئەمـیش دەس‌بـەدەس بـە یاسـای ئـەدەب
هاتــە خــوارەوە بــە ئــەعــلا حــەســەب
هــەمــوو مولتــەزیم بــۆ ڕێگــەی ســەواب
لــە ســەر قاعیــدەی ســوننەت و کیتــاب
هــەمــوو ئــەمانــە لــە کــاتی خۆیــا
گــەیاندوویانــە بــە ئــەهلــی دونیــا
ئـەوەی خــاریج بــێ لـە یاسـای ڕەهبــەر
(فـــاجتنبوه واحـــــذروا الحـــــذر)
بـــە ئیتتیفـــاقی عولـــەمـــای ئـــەعـــلام
عالـەمیـان گـەیانـد بـە بـەهـرەی ئیـسلام
بـە خۆشــەویــستی خــودا و پێغــەمبــەر
بـــە خۆشـــەویـــستی یـــارانی ڕەهبـــەر
بـــە ئیحترامـــی حـــەرەمـــەکـــانی
بـــە حـــوببی ئـــالی عـــالی مـــەکـــانی
بـە حـوببی هـەمـوو زومـرەی تـابیعین
حـــوببی زانایـــان لـــە (مجتهـــدین)
بـە حـوببی عـیلم و عولـەمـای ئیـسلام
بـە حـوببی هـەمـوو ئـەولیـای کـیرام
موسوڵـــمان دیـــنی بـــۆ دائـــەمـــەزرێ
لــە ســەر خاتیمــەی حـەسـەنـە ئـەمـرێ
خودایــە (نــامی) بــە حــوببی ئــەمــان
بــژی جــا بمــرێ و بــڕوا بــە ئیمـــان

هـــەمـــوو ئـــەمانـــە لـــە کـــاتی خۆیـــا
لـــە ســـەر قاعیـــدەی ســـوننەت و کیتـــاب

سوپاس بۆ خوا لێبوومەوە لە نووسـینی ئـەم کتێبـە نـازدارە کـە (سـەنـای ڕەهبـەر و یارانـە) پـاش نیـوەڕۆی ڕۆژی چوارشـەممـەی حەڤدەهەمی مانگی ڕەبیعی یـەکـەمـی ساڵـی هـەزار و چوارسـەد و شەشی کۆچی، ڕێکەوتی چواری مـانگی دوازدەی هـەزار و نۆسـەد و هەشتا و پێنجی میلادی (١٩٨٥/١٢/٤) لە ژووری مـەدرەسـەدا، لـە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیـلانی **«قدس الله سـره وزاد خیـره و برکاته لنا وللمسلمین»**.

## بەشی سێیەم: سکاڵا

بسم الله الرحمن الرحیم

لـــە پـــاش سوپاســـی نیعمـــەتی (الله)
لــە پــاش ســتایش بــۆ (رســـول الله)
موناجـــات ئـــەکـــا بـــە دڵ و دەروون
(نـــامی) بـــۆ دەوای دەروونی زەبـــوون
پاڕانـــەوەیـــە بـــە لاڵـــە و پاڵـــە
لــە دەرگــای خــودای خــاوەن کــەماڵــە
لـە سـەر ژمـارەی ئـەسمـای حوسـنای ئـەو
دڵ ئـــەکـــەمـــەوە بـــۆ تـــاوی پڕتـــەو
نـــەوەد و نـــۆ نـــاو بـــە نـــووری بـــاهیر
سـەرچـاوەی ئـەسـرار (بـاطن) و (ظـاهر)
بـــە داوێـــن‌گـــیری خـــاوەن ڕیـــساله
کــە بــۆ شــەفاعــەت خــاوەن مــەجالــە
بۆ عەفووی خـودای خـاوەن فـەزل و وجـوود
بـە تکـای دارای مـەقـامی مـەحمـوود
دروود ببـــارێ بـــە وێنـــەی بـــاران
لـە سـەر ڕۆحـی ئـەو هـەم ئـال و یـاران
هـەم ئـەلی بـەیـتی خـاوەن مـەقـامی
تـا پڕتـەو ئـەدا نـووری ئیـسلامی
(یـــا الله) زاتی ســـاحیب کـــەمـــالات
پـاکیزە لـەبـۆ هـەوای خـەیـالات

(واجـــب الوجـــود) بــێنیــاز لــە کــەس
قــەدیم و بــاقی تــەنیــا و فریــادڕەس
بــێوێنــە و مانــەنــد بــێشــێوەی نیــاز
بــەری لــە وەهمــی ئینــسانی دەمبــاز
پــاک لــە تویکــلی تێکــەلــی مایــە
بــێ مــادە و ســێبەر بــێ عیللــە و غایــە
خــاوەن شــانەکــەی بــێشــوێن و بــێلــەش
پادشــای جیهــان فــەرمانــڕەوای عــەرش
خــاوەن تــەجــەلــلای دوور لــە کــات و ئــان
حــازر لــە هــەمــوو زەمــان و مــەکــان
دارای کــەمــالات بــەری لــە نوقــسان
سەرچــاوەی هــەمــوو پــیرۆزی و ئیحــسان
ڕەحمــێ بفــەرمــوو بــە حالــی (نــامی)
هــەم بــە یــارانی ڕێگــەی ئیــسلامی
پــەروەردگــاری ڕەحمــان و ڕەحــیم
میهــرەبــان بــۆ عــام بــە فــەیــزی عــەمــیم
گوشــادکەرەوەی، دەروازەی بــەهــەشــت
بۆ بــەنــدەی ســالم لــە شــار و لــە دەشــت
دەرگاکــەرەوەی، دۆزەخ بــۆ ئــەشــرار
بــۆ ئــازار دانیــان بــە عــەزابی نــار
کاتــێ کــە دۆزەخ واز ئــەکرێتــەوە
دەســتی بــێبایــەخ ئــەبــەســرێتەوە
تــا دێنــە مــەیــدان گــشت ســتەمبــاران
حــەقیــان ئــەســەنــێ لــە ســتەمکــاران

یانــێ ســتەمکــار عــەزابیــان ئــەدرێ
ستەمبارانیش دڵـیان خـۆش ئـەکـرێ

پــەروەردگـــاری ڕەحـــیم و ڕەحمـــان
خاوەن سـەخاوەت خـودای میهـرەبـان

دەروازەی ڕەحمـــــەت بکـــــەرۆ لێمـــان
ســفرەی نیعمــەتــت ڕابخـــە بۆمـــان

بـــەبـــێ تـــەماشـــای نوقـــسانی زاتم
بـەبـێ تـەماشـای نـەقـسی سـیفاتم

عــەفــوم بفــەرمــوو مــەپرســە لــە کــار
کـــاری تـــاوانی (نـــامی) خـــەتابـــار

هـــەم لـــە کۆمـــەڵـــی برایـــانی دیـــن
هـاوڕێی سـەفـەری ڕێـی (عـین الیقـین)

**الملک**

(ملـــک)ی پاشـــای ســـەراســـەر عالـــە
سـافیل و عـالی تـا عـەرشـی ئـەعـزەم

فــەرمانــڕەوای حــەق لــە ســەر کائینــات
بـەهـەشـت و دۆزەخ، ئـەرز و سـەمـاوات

پادشـــای موتـــڵەق بـــە ســـەرفـــەرازی
فــەرمــوو بـــە شـێوەی بــەنــدەنــەوازی

ببــەخــشە جـورمی بـەنـدەکـەت (نـامی)
چـون والــە گوێیــا حــەلقــەی غــولامی

هــــــەروا تـــــــاوانی بـــــــرادەرانی
بـــــرای بـــــەنرخـــــی ڕۆزگـــــارانی

## القدوس

(قـــــدوس)ی عالـــــەم تـــەقدیـــــست
بـە حـاڵ و بـە قـاڵ تـەسـبیحت ئـەکـا
ئــەوەی زمـــانی ڕام نـــەبـــێ لــە بــۆی
با بـۆ خـۆی بگـری بـۆ بـەدبـەختـی خـۆی
چــون مــادام دووره لــە زیکــری ســوبحان
دووره لـــە خێـــری نیعمـــەتی ئیحـــسان
بـــە فـــەیـــزی ڕەحمـــەت زمـــانی حاڵــم
بکــە بــە مایــەی بــەهــرەی کــەماڵــم
زمـــانی قالـــم بێنـــە ســـەر بـــەیـــان
بـــۆ تـــەقدیـــسی خـــۆت بــە تــوولی ژیـــان
تـــا کاتـــێ مـــردم زمـــانم تـــەڕ بـــێ
بـە ئـەزکـاری تـۆ سـەرچـاوەی فـەڕ بـێ
نمـــێ لـــە فـــەیـــزت بـــەســـە بـــۆ (نـــامی)
لــــە پایــــە و مایــــە و حوســــنی خیتــــامی

## السلام

یـــا ســـلام ســـلم مـــن ســـوء الاحـــوال
مـــن ســـوء الاعمـــال، مـــن ســـوء الاقـــوال
بمانپـــــارێزه لــــــە وەبـــــای هـــــەوا
لـە نـەفـس و شـەیتـان لـە مایـەی ئیغـوا
هـــــەوایـــــە هـــــەوا بناغـــــەی تـــــاوان
هـــــەوایـــــە هۆیـــــە بـــــۆ شـــــێتی لاوان
گــەلــێ لــە مــەردان بــە هــەوای فــەســاد
دەرچوون لـە سـوودی مـەوعیـزه و ئیرشـاد

وامـــا مـــن خـــاف مقـــام ربـــه
اســـتفد منـــه الـــى دربـــه
و نهـــى الـــنفس عـــن طـــوع الهـــوى
یـەقـین بـەهـەشـتی ئـەبێ بـە مـەئـوا
هەـــەشـــتی مـــاوای بـــەختیارانـــە
ئـــەنجـــامی ســـەعیـــی ڕۆزگارانـــە
خودایـــا (نـــامی) لـــە بـــاری تـــاوان
عـەفـو بفـەرمـوو بـە سـەفـای ئـەوان
هـــەروەهـــا گـــەلـــێ بـــرادەرانم
گولـــــی گولـــــزاری ڕۆزگـــــارانم

## المؤمن

ئـەی خـودای (مـؤمن) ئـەمـن و ئیمانـدەر
بمانپـــارێزە لـــە دەریـــای خـــەتـــەر
بـــێئـــەمـــانی تـــۆ قـــەلا بـــەلایـــە
بـــە (ضـــمان)ی تـــۆ بـــەلا قـــەلایـــە
هـەر تـۆی بـەڕاسـتی سـەرچـاوەی ئـەمـان
هەر تـۆی بـەدەسـتی بـۆ پـەنـا و (ضـمان)
(نـــامی) بـــە زیکـــری تۆیـــە ئـــەمـــانی
بـــە یـــادی تۆیـــە تـــاوی ئیمـــانی
بمانپـــــارێزە لـــــەگـــــەڵ یارانـــــا
لـــە دەردی گـــەردی بـــەردەبارانـــا

## المهيمن

خـودای (مهـيمن) بـه هـەیمـەنـەی تـۆ
سـەرداری ئـەکـرێ لـه سـەر وەحـشی کـۆ
هیممەت و هەیبەت هـەیمـەنـه و نـەسرەت
لــه تــۆوه هــاتن بــۆ ڕۆحــی حــەزرەت
(نــصرت بالرعــب) نــەســرەتی تــۆ بــوو
ســەرکــەوتــنی بــەدر هــەیبــەتی تــۆ بــوو
فریـشتەی فـەلـەک بـوون بـه سـوپای ئـەو
تــەوژمــی ســەبــا بــوو بــه ئــاڵای ئــەو
هەر تۆی بـۆ هـەر کـەس حـەساری ئـەمـان
هــەر بــۆ تــۆ ئــەشــێ قــەراری زەمــان
بمانپـــــارێزه خـــــودای توانـــــا
لــه پــەنــا بــردن بــۆ لای بــێپــەنــا
(نــامی) دامــاوی ســـەرلـــێشـــێواوه
لــه پــەنــای تــۆدا بــوو بــه ســەرچــاوه
بــه هــەیمــەنــەی خــۆت لــەگــەڵ یارانـا
بمانپـــارێزه لـــه شـــەڕبارانـــا

## العزيز

نــەجمــه و نیـشانەی ســەرشــانی عــەزیــز
خــەڵاتی تۆیــه بــۆ مایــەی تــەمیــز
پــەروەردگــاری و عــەزیــزی بــه زات
عیــزەتی ڕەهبــەر لــه لای تــۆوه هــات
عیـــزی موئمینـــان نیـــشانی تۆیـــه
ئیعــزازی مــەردان لــه شــانی تۆیــه
ئــەوەی لــه تــۆوه نــەگــا بــه عیــزەت
ســەر ئــەخاتــه ســەر ســەریــنی زیللــەت

بــە عیــززەتی خــۆت عیــززەتمــان بــدە
بــە دەردی زیللــەت حــەســرەتمــان مــەدە
عــەقــل و ئیمــان و عــیلم و عــەمــەلمــان
بکــە بــە شــادی کــاتی ئــەجــەلمــان
(لله العـــــــــزه وللرســـــــــول
و للمـــــؤمنین عنـــــد الوصـــــول)
لە عەینی عیــززەت عــەبــدی خــۆت (نــامی)
دڵــی تــەڕ بکــە بــۆ خــۆش‌ئــەنجــامی
لــــەگــــەڵ کۆمــــەڵــــی برایــــانی کــــار
هــاوڕێی دەشــت و دەر لــە لادێ و لــە شــار

## الجبار

ئــەی پــەروەردگــار، (جبــاری مکــسور)
بە جەبرت مەکسوور ئــەبــێ بــە مــەنــسوور
مومیــای جــەبــری، شکــستەی دڵــم
هــەر جــەبــری تۆیــە، ڕۆژی حاســڵم
هــەر لــوتفی تۆیــە، ئــەی پــەروەردگــار
هــەر عــەتفــی تۆیــە، بــۆ بــەنــدەی بــەدکــار
(نــامی) نــەمــاوە تــەوانــای دڵــی
موحتــاجی نــووره بێتــە مــەنزڵــی
ڕوونــاک بێتــەوە دڵ و مــەنزڵــمان
لــەگــەڵ یــارانی هــاودڵ و گــڵمان

## المتكبر

یـــا (متکبـــــر) خـــاوەن کیبریـــا
فـەرمانـڕەوای حـەق لـە هـەر دوو دنیـا
کـەمـێ لـە عـەتـات ئـەبـێ بـە دونیـا
نمـێ لـە فـەیـزت ئـەبـێ بـە دەریـا
تکـــێ بـــارانی هـــەوری ئیحـــسانت
بۆ سەلـب و ئیجـاب بـە حـەق یـەکسانت
بـەسـە بـۆ هـەمـوو دڵبـەسـتەکانـت
بـەسـە بـۆ هـەمـوو سـەربـەسـتەکانـت
(نـامی) و یـارانی بـەنـدەی بـارەگـان
ئـەگـەر ئاگـادار، ئـەگـەر بـێئاگـان

## الخالق

ئــەی پــەروەردگــار خــالیقی عالــەم
خـاوەنی عـەرش و بـارەگـا و عـەلـەم
عالـەم بـە خـەلقـی تـۆ هاتـە وجـوود
بـە جـوودی تـۆ بـوون، بـە خـاوەن وجـوود
مــادام ئــەساسـی بـوونم بـە تۆیـە
عـەیـنم عـەرەزم ڕەنگـە یـا بۆیـە
هـەروەهـا ڕەنگـی عـەفـوم لـە تۆیـە
بـا دامـەزراو بـێ نـەبـێ بـە بۆیـە
بـە ئیحـسانی خـۆت ئـەی پـەروەردگـار
(نـامی) ببـەخـشە لـە بـای ڕۆزگـار
بـێمـادەی نـوور و تـەجـەلـلای قودسـی
ئـەمێنێتـەوە بـە تینـوو و برسـی

لـەگـەڵ یارانـا لـە (حـوض المـورود)
بـا تێـراو بـبن بـە زولالی جـوود

## الباری

بـاری تـەعـالا پـەروەردگـاری
خـالیقی سـووره و نـەقـش و نیگـاری
هـەر سـەرچـەشمـەیـێ ئـاوی ڕەوانـە
لـە دەر و دەشـتە و لـە کۆسـارانە
نمـێ لـە فـەیـزی (ڕیعایـەی) تۆیـە
کـەمـێ لـە مایـەی عینایـەی تۆیـە
دەی بـە فـەیـزی خـۆت خـالیقی ئـەکـرەم
ببـەخـشە خـەتـام، ئـەر زۆره یـا کـەم
چـون بـە ژمـاره بـە فـەیـزی سـەرمـەد
وام لە نـاو ڕیـزی ئوممـەی (محمـد) (ص)
قـەت دەرنـاکرێ یـەکـێ لـە هـەزار
تایبـەتی (نـامی) دامـاوی هـەژار
دەی بمانبـەخـشه لـەگـەڵ یارانـا
لـەگـەڵ کۆمـەڵـی تاوانبارانـا

## المصور

تـۆی (مـصور)ی بـە (أحـسن تقـویم)
تۆی ڕێنومای حـەق بـۆ سـیدق و تـەسلیم
سـووره‌تـت وا کـرد بـا سـیرەت وا بـێ
یـانی بـا دڵـمان زانـا و ئاگـا بـێ

مەمکە بە (أسفل من السافلین)
بەڵکوو بە دارای نامەی (علیین)
مادام تۆ خاوەن بەهرەی ئیکرامی
قەڵەم لابەرە تاوانی (نامی)
لەگەڵ کۆمەڵی برادەرانا
لە ڕیزی سوپای شای ڕەهبەرانا

## الغفار

خودای غەففاری پۆشندەی تاوان
هەر پەنای تۆیە پەنای داماوان
داماوی نییە وەک تاوانباری
بۆ ئەنجامی بەد بۆ شەرمەزاری
غەرقی تاوانم سەر تا بە دامان
پەنام هێناوە ئامان سەد ئامان
خۆت ناوی خۆت نا بە ناوی (غفار)
بۆ تاوانبەخشی شەخسی تاوانبار
بە سیرڕی بەرزی ناوی (غفار)ی
(نامی) ببەخشە لە تاوانباری

## الستار

(ستار)ی سرپۆش لەبۆ عەیب و عار
بۆ شەرمەزاری بەندەی تاوانبار
ئەگەر عەیبی من پڕ بە دونیایە
پەردەی سەتتاریت بێئینتیهایە

نیـــسبەتی نییـــە تـــاوانی مـــەعـــدوود
لـــەگـــەڵ ئیحـــسانی عـــامی (لامحـــدود)
نمـــێ حـــەیـــای تـــۆ کـــەوتـــە ڕووی دونیـــا
عالـــەم کـــەوتـــە نـــاو شـــەپـــۆلی دەریـــا
(نـــامی) ئـــەگـــەرچـــی زۆر شـــەرمـــەزارە
(الحمـــــــدالله) خـــــودا (ســـــــتار)ە

## القهار

ئـــەی قـــەههـــار کاتـــێ قـــارت بێتـــە جـــۆش
فریـــشتەی فـــەلـــەک دێنـــە ســـەر خـــرۆش
پێغـــــەمبـــــەرانی عالـــــەم ســـــەراســـــەر
دێنـــــە ســـــەر بـــــانگی (ألله اکبـــــــر)
بـــــاقی ئـــــادەمـــــی ئـــــارامی نابـــــێ
ئـــەگـــەر تـــۆزێ قـــار لـــە ســـەریانـــا بـــێ
پـــەری وەک دێـــوان ئـــەدەنـــە کێـــوان
ئـــەپاڕێنـــەوە لـــە ســـەر لـــێشـــێوان
بـــە کـــورتی (عاقـــــل) حالـــــی نامێنـــێ
لـــە بـــەر قـــاری حـــەق دۆش دائـــەمێنـــێ
کـــێ بـــێ خـــۆی بگـــرێ لـــە بـــەر قـــاری تـــۆ
لـــە بـــەر هـــەیبـــەتی پـــڕ ئـــازاری تـــۆ
ســـاخودا بـــە حـــەق ئـــاگری خـــەلیـــل
کـــە بـــوو بـــە بـــەفـــراو بـــۆ چـــاری زەلیـــل
(یـــا نـــار کـــونی بـــردا وســـلام)
کـــردت بـــە پـــاریز لـــە دەرد و ئـــالام

بە عەفوی یەعقووب بە سەبری (أیوب)
بە سیدقی ڕەهبەر ئەحمەدی مەحبووب
بە فەیزی قودسی ئەی خودای (غفار)
(نامی) ببەخشە لە قاری (قهار)
تا لە ژێر ئاڵای ئەو بەهرەدارا
لەگەڵ برایان لە ڕۆژگارا
لە سایەی لیوای بەرزی ڕەهبەرا
بڕۆین بە سارای پانی مەحشەرا

### الوهاب

یا وەهھابی خێر عەتا فراوان
بۆ شا و بۆ گەدا، بۆ شوان و گاوان
پەروەردگاری جیهانئافەرین
بە وجوود بە جوود بە شەهدی شیرین
لە عەتای تۆیە فەزیلەی قودسی
(سامانسا)[9] ئەکا ڕەزیلەی نەفسی
کائینات لای تۆ (ذره)ی هەوایە
ئەگەر بێتە سەر عەون و (عینایە)
وەهھابی نیعمەت بە خاوەن کەماڵ
عیلم و عەمەل و ڕەوشتی ئەحوال
هەمووی لە کانی ئیحسانی تۆیە
هەموو لە خوانی پڕعەتای تۆیە

---

٩. سامان: دەشت، سا: ساف، سامانسا: سامالسا، واتە دەشتی ساف.

فهـــــب عبـــــدک العليــــــل (النـــــامی)
نـــدی مـــن فـــيض الـــسحاب الـــسامی

## الرزاق

ڕەززاقـــی ڕۆزی غـــەبـــووق و ســـەبـــووح
بە قـووتی نوفـووس هـەم بـە قـووتی ڕووح
خـــوانی خـــۆراکی جـــیرەخوارانـــت
مـــادەی مائیـــدەی پـــانی دیوانـــت
گوشـــادە بـــە قـــەد جیهـــان ســـەراســـەر
بـەڵ لـە ئاسمـان سـەر ئـەخاتـە سـەر
لـــە خـــاک لـــە هـــەوا لـــە قووڵـــی دەریـــا
(مـــا تحـــت الثـــری) هـــەتـــا ســـورەییـــا
بـــە شـــێوەی گـــشتی ڕۆزیخـــۆری تـــۆن
مێـــوانی خـــوانی پرســـەمـــەری تـــۆن
بـــەچکـــە لـــە ســـکدا ســـکاڵا ئـــەکـــا
لـەبـۆ بـەهـرەی خـۆی دەس بـاڵا ئـەکـا
بـــەڵام (متقـــی) یـــا (مکتـــسب) بـــێ
ڕزقـــی (مـــن حیـــث لایحتـــسب) دێ
بـــۆ (نـــامی) نمـــێ ڕەحمـــەت کافییـــە
بـــۆ هـــەر دوو دنیـــا بـــە حـــەق وافییـــە

## الفتاح

یـــا (فتـــاح)ی بـــاب بـــۆ فـــەوجـــی ئـــەرواح
خودای فـەرەحبـەخـش بـە نـووری سـەبـاح

شـنۆی نـەسـیمی نیـسبەتی قودسـی
بـەسـە بـۆ شـیفای زەحمـەتی نـەفـسی
بـۆنی بـاغی قـودس کـە دای بـە دڵـدا
عوتـوور ئـەڕێـژێ بـە سـەرمـەنزڵـدا
عـەتـری گولـباخی کـە دای لـە دەمـاخ
ئـەبـێ بـە دەوای دەمـاخی پـڕداخ
نـەسـیمی شـەوبـۆی نیـسبەتی سـامی
بـەسـە بـۆدەوای دەروونی (نـامی)
بـەسـە و ڕەسـایە بـۆ حـاڵ و بـۆ مـاڵ
بـۆ عـەقـڵ و عـەمـەل، بـۆ پایـەی کـەمـاڵ
یـانی (کافییـە) بـۆ ژیـن و بـۆ دیـن
تـا کـاتی لیقـای (رب‌العـالمین)

## القابض و الباسط

قـابیز و باسـیت بـە یاسـای حیکمـەت
بۆ دەرگای زەحمـەت بـۆ ڕێگـای ڕەحمـەت
(قـابیض)ی ئـەرواح لـە گیانلـەبـەران
چ بـۆ فـەقـیران چ بـۆ ئـەمـیران
شـوئوونی فیعلیـت لـەگـەڵ عالـەمـین
خـاوەن حیکمـەتـن لای قـەلـبی ئـەمـین
قـەبز و بـەسـتی کـار لـە خێـر و لـە شـەڕ
بـە فـەرمـانی تـۆ سـەر ئێننـە دەر
لافـاوی زەحمـەت ئـەگـەر بێتـە خـوار
هـەر ڕەحمـی تۆیـە پـەنـای ڕۆزگـار

بـەو ڕەحمـــە کــردت لــەگــەڵ ئــادەمــا
کــردت بـــە جێـــدار لـــە نـــاو عالـــەمـــا
بـەو ڕەحمـە کـردت بـە حـەزرەتی (نـــوح)
کـردت بـە خـاوەن بـۆ نـەسـر و فوتـووح
بـەو ڕەحمـە کـردت لـەگـەڵ (ابـــراهیم)
کـە ڕزگـارت کـرد لـە نـاری جـەحـیم
بـەو ڕەحمـە کـردت لـەگـەڵ مووسـادا
فیرعـــەون و سـوپات بـــۆ دا بـــە بـــادا
بـە ڕەحمـە کـردت لـەگـەڵ (أيوبـــ)ـــا
بـە شـیفا و سـەفـای لـەگـەڵ مـەحبووبـا
بەو ڕەحمە کـردت بـە عـەسـای مـەسـعوود
کـە ڕزگـارت کـرد لـە فیتنـەی یـەهـوود
بـەو ڕەحمـە کـردت لـەگـەڵ (محمـــد)
بـــە ڕیـــسالەت و دیـــنی موئـــەییـــەد
بـردت بـۆ (میعـــراج) بـۆ (فـــوق‌الـــسماء)
بـــۆ لای حـــەزرەتی (علـــم‌الاســـماء)
ڕەحمـــێ بفـەرمـوو بــە ئـەهلـی ئیـسلام
لـە شـەڕ دەریـان کـە بـۆ سـارای سـەلام
ئـەوەی دوژمنیـی ئـەهلـی خـەیـر ئـەکـا
لـە ڕێگـەی دونیـا مـەنعـی سـەیـر ئـەکـا
ســـەرنگـــوونی کـــە لـــە لمـــی دەردا
کـــەللەی پڕهـــەوای بـــدە بـــە بـــەردا

هەرچی مەیلت بوو بیدەی بە هەرکەس
کەس یارای[١٠] نییە دەس بێنێ بۆ دەس
ئەوەیش مەیلت بوو بێگێڕیتەوە
کەس یارای نییە بیسێنێتەوە
لە قەبز و بەستا لە ڕووی ڕۆزگار
هەر تۆی ساحیب و فەرمانڕەوای کار
دەی بە لوتفی خۆت بێرە سەر ئیحسان
گەلی داماوان موسولمانەکان
فاقبض عنهمو يد الاعداء
واحفظهم فضلا من البلاء
وابسط أيادي العطف الينا
واحبب سجال اللطف علينا
بحق الذي له اللواء
له المعراج له الاسراء

## الخافض و الرافع

(خافض)ی پایەی دوژمنانی دین
(رافع)ی ئەهلی ئیمان و یەقین
ئەویان بوو دەرەک ئەمیان بۆ فەلەک
ئەویان بۆ لای (جن) ئەمیان لای مەلەک
(خافض)ی پایەی تاوانبارەکان
(رافع)ی پایەی تەوبەکارەکان

---

١٠. یارا: توانا

(رافــع)ی ئــالای دیــنی ئــەحمــەدی
مــن بعــدِ الــنبی الی الابــد
خــافیزی ئــالای بــەلاخواهــەکــان
ڕافیعــی ئــالای حــەق‌پــەناهــەکــان
خــافیزی پایــەی بــێ‌هۆشــی غــافڵ
ڕافیعــی پایــەی ئینــسانی عــاقڵ
بوڵــەندکــەرەوەی نــاوەکــەی ڕابــەر
لــە ســەر منــارە و میحــراب و مینبــەر
بمانپــارێزە لــە کــوفر و بیدعــەت
دامانمــەزرێنــە لــە ســەر شــەریعــەت
بمانبــە لــەگــەڵ شــا لیــوای ئیــسلام
بــە بــیر بــە کــردار بــە واتــە و کــەلام
لــە بــەرەنومــای دیــنی ئیــسلامی
لوتفــێ بفــەرمــوو دەرحــەق بــە (نــامی)
لــەگــەڵ کۆمــەڵــی برایــانی دیــن
بــا بــژین لــە ســەر مینــهاجی تــەمکــین

## المعز المذل

یــا (معــز) بــە عــەدل یــا (مــذل) بــە داد
فــەرمانــڕەوای حــەق بــە یاســای ڕەشــاد
تــۆی عیــززەت ئــەدەی بــە ســەر گــەدادا
زیللــەت ئــەهــێنی بــە شــانی شــادا

شـــوانێ بـــە شـــەوێ ئـــەكـــەی بـــە شـــایە
شـــایە دائـــەخـــەی بـــۆ بـــنی چایـــە
ئـــەمانـــە هـــەمـــوو بـــە ڕووی حـــەقیقـــەت
كـــرداری تـــۆن و پـــڕن لـــە حیكمـــەت
یـــەكـــێ بـــایی بـــوو بـــایێكی بـــەســـە
ئـــەمـــە ئـــەزانـــێ هـــەركـــەســـێ كـــەســـە
دەمـــەی وەیـــشوومەی گـــەردنـــەی (كـــاوێ)[11]
بایـــەكـــی بـــەســـە و زەحمـــەتی نـــاوێ
بـــەرزی بـــە ســـەفـــای یـــاری تـــۆ ئـــەبـــێ
نزمـــی بـــە جـــەفـــای قـــاری تـــۆ ئـــەبـــێ
(معـــز) و (مـــذل) و (خـــافض) و (رافـــع)
هـــەر یاســـای تۆیـــە بـــە یاســـای واقیـــع
تـــاخودا بـــدا عیـــززەت و شـــانت
كـــەس هـــەڵـــناگرێ نـــەجمـــەی ســـەرشـــانت
ویـــستی بیگـــۆڕێ بـــە بـــارێتـــرا
جێـــت تاریـــك ئـــەكـــا بـــێ شۆڵـــەی چـــرا
خـــودا یـــارت بـــێ عالـــەم یـــاوەرتـــە
بێگانـــەی غـــەریـــب وەك بـــرادەرتـــە
یـــا مـــن ذاتـــه قـــد عزوجـــل
مـــن اســـتعان بغیـــرك ذل
بـــە عیـــززەتی خـــۆت ئـــەی خـــاوەن (اكـــرام)
ئیعزازمـــان بكـــە بـــە دیـــنی ئیـــسلام

---

١١. كاوێ: كێوێكە كەوتووەتە سەرووی دێی (بیارە)ی سەر بە قەزای هەڵەبجە.

ئــــەپارێتـــــەوە (نــــامی) لـــــە دەرگــــات
بـــــۆ پــــارازتنی لـــــە بــــای دەرەکــــات
تـــــا ســــــەرەنجــــامم نــــاوی خـــــودا بی
مـــەیـــدانی دەروون بـــە نـــوور ئـــاوا بـــێ

## السميع البصير

بـۆ دەنــگ و بــۆ ڕەنــگ (ســميع و بــصير)
بــێڕەنــگ و بــێدەنــگ (علــيم و خبيــر)
بــا شــنەوای دەنــگ میرووڵــەی بــێدەنــگ
لــە (تحــتالثــری) لــە ســەر سیاســەنــگ
وەکــوو دەنگــی پێــی ئــەسـپی تــازەنــاڵ
لــە لای ســـوارێکی هوشــیار و خۆشـــحاڵ
بینـــا بـــە مـــادەی زەڕەی بــێتـــەقـــسیم
وەکـــوو بینـــایی بـــۆ لاشـــەی جـــەسـیم
لـــە بـــەر بیـــستن و بینـــایی زاتـــت
دەرناچــــێ شـــتێک لــــە کائیناتــــت
خودایـــا بـــە حـــەق ئیـــسمی ئـــەعـــزەمــت
بـــە کابـــە و ئـــەرکـــان بـــە مولتـــەزەمـــت
هێـــزی حــــەواســـم بـــۆ بپــــارێزی
دەنــگ و ڕەنگــی خــۆش لــە لام نــەبێــزی
چـــاوم بـــۆ دەرکــــی عیبـــارەت وابـــێ
مـــودریکی شــــەددەی نــــاوی (الله) بـــێ

دەمـــاغم دەرکــــی بـــێنی گـــوڵ بکـــا
تـــا دڵ ئـــارەزووی زەیـــنی دڵ بکـــا
زائیقـــەم زەوقـــی بـــۆ چـــەشـــەی یـــاران
بـــڕوا وەکـــوو تـــەیـــر بـــۆ ئـــاوی بـــاران
دەســـــتم لـــــە دەســـــتی دۆســـــتانا بـــێ
پـــێم بـــا لـــە ســـەر ڕێـــی ڕاســـتانا بـــێ
ئـــەمـــەیـــە بـــەهـــەشـــت فـــیردەوســـی ســـامی
بیکـــا بـــە خـــەلات خـــودا بـــۆ (نـــامی)

## الحکم العدل

ئـــەی پـــەروەردگـــار (یـــاحکم) بـــە حـــەق
لـــە ســـەر عیبـــادات نیـــک و بـــەد موتـــڵەق
ئـــەوەی ئیمـــانی هـــەیـــە بـــە زاتـــت
موســـووفە بـــە حـــەق بـــە گـــشت ســـیفاتت
ئـــەزانی لـــە ســـەر (مـــؤمن و کـــافر)
لـــە ســـەر تاوانبـــار (بـــاطن) و (ظـــاهر)
تۆی حەکەمی داد لـە بـەیـنی خـەسمـەیـن
بە فەسڵی خیتـاب لـە بـەیـنی (قـسمین)
ئیرشـــادت کـــردن بـــە ڕەویـــەی ســـەواب
بـــە عـــەقـڵ و ڕەهبـــەر بـــۆ ڕێگـــای ســـەواب
عـــوزرت بـــۆ نـــەهێـــشت ئینـــسانی (عـــاقڵ)
لـــە ســـەر کـــرداری نـــاقیس و کـــامڵ
ئیتـــــر لـــــە وادەی حـــــەق و حیـــــسابا
عـــــوزرت نامێنـــــێ لـــــەگـــــەڵ خیتابـــــا

تــۆ خــۆت کــە زانــای بــیر و بــاوەڕی
بینـــای کـــردەوەی چ خێـــر چ شـــەڕی
ئـەگـەر نـەڕوانـین بـۆ یاسـا و عـادەت
چ حاجــەت لــەبــۆ داوا و شــەهــادەت
کاتــێ جــەم ئـەکـەی ئـەعیـانی ڕوسـول
یـــانی ڕەهبـــەران (لخیـــر الـــسبل)
تـــا لـــە نـــاو (جـــن) و بـــەنیئـــادەمـــا
حـــەق وازیـــح بـبی لـــە نـــاو عالـــەمـــا
انـــت الحـــاکم العـــادل اللطیـــف
انـــت الحکـــم الحـــق بالتـــشریف
خودایـا بـە حـەق وەسـفی حـەکـەمـی
لــەو دادگـــادا بـــێزیـــاد و کـــەمـــی
ڕزگارمـــان بکـــە لـــە دەریـــای حیـــساب
بـــێموناقـــەشـــە و بـــێمـــەوجـــی عیتـــاب
(نـــامی) بـــۆ دەرگـــات پـــەنـــای هێنـــاوە
هـــەر هیـــوای لـــوتفی بـــە لاوە مـــاوە

## العدل

مـــەعنـــای عـــەدلـــی تـــۆ نایـــەتـــە وتـــار
بـــە خامـــە و نامـــە و فیکـــر و ئیعتیبـــار
بـــــــە (لا یظلـــــــم مثقـــــــال ذره)
دەرکــەوت عــەدلی تــۆ لــەم کــوێر و کــەڕە
تــۆ کــە عیلمــەکــەت عامــە بــۆ عالــەم
بــۆ تــەندورووســتی بــۆ ئــێش و ئــەلــەم

دیـــارە دادی تـــۆ لـــە نـــاو ئـــەحکامـــا
لــــە دادگـــــاهی دیـــــنی ئیـــــسلاما
بـــۆ گیانلـــەبـــەران حـــەیـــوان و ئینـــسان
بـــۆ دێـــو و پـــەری بـــۆ یاســـای یـــەکـــسان
ئـەی خـودای (عـادل) لوتفـت بێنـە پـێش
لوتفـــت شـــامیلە بـــۆ شـــا و بـــۆ دەروێـــش

بـــە ســـیرڕی لوتفـــت ببـــەخـــشە (نـــامی)
بـــا ڕســـوا نـــەبـــێ لای ئـــاری و ســـامی
(نـــامی) بـــە پـــاکی وێنـــەی ئاوێنـــە
بنوێنـــە چـــونکی خـــاکی داوێنـــە
بـــە جـاهی ئـەحمـەد سـاحیبی ئیـسلام
بـــڕژێ بـــە ســـەریـــا ســـەلات و ســـەلام

**اللطیف**

(یـــالطیف) لوتفـــت لـــە گولـــباخی بـــاخ
زۆر ناســـکترە بـــە شـــنۆ و پـــەرداخ
بـەو لوتفـەی هـەتـە ئـەم سـەنگی سینە
بکـــە بـــە ســـەفحـــەی پـــاکی ئاوێنـــە
مینـــای ســـینەکـــەم بکـــە بـــە ســـینا
بـــە نـــووری ئیحـــسان بیکـــە بـــە مینـــا
بـــۆ دەرکـــی ســـیرڕی مـــەعنـــای لـــەتیفـــی
بیکـــە بـــە ئوســـتاد بـــەبـــێ تـــەکلیفـــی

حـــەل بکـــە بۆمـــان گرێـــی موشـــکیلات
هـــەردەی داڕووخـــاو بکـــە بـــە بـــسات
خـــاوەن قـــودرەتی بـــۆ تـــۆ ئاســـانە
لوتفـــت ســـەرچـــاوەی دەریـــای ئیحـــسانە
مـــەعلوومـــە لوتفـــت دەریـــای بـــێپـــەیـــە
لـــە بـــەڕ و بـــەحـــر و ئـــەفلاکـــا هـــەیـــە
ســـیرِی ئـــەلتافـــت بـــەحـــەق جارییـــە
لـــە نـــاو ئـــەســـیرا لوتفـــت ســـارییە
عـــەرش یـــا کورســـی دۆزەخ یـــا بـــەهـــەشـــت
کێـــو و کۆســـار و هـــەردە و دەر و دەشـــت
بە یەک جیلوەی لوتف هەمووی خۆش ئەبێ
گولـــی هـــەلاهـــەل داررووی نـــۆش[١٢] ئـــەبـــێ
لوتفـــت ســـارییە لـــە نـــاو مـــەنـــزڵا
لـــە ســـینەی ســـافا لـــە پـــەڕەی دڵا
لـــەگـــەڵ زەڕراتی وردی کائینـــات
لوتفـــت ســـابتە بـــە هێـــزی ئایـــات
زەمـــان چ (ماضـــی) چ (حـــال) چ (حاضـــر)
چ ئیـــستیقبالی عـــەقـــڵی مونتـــەزیـــر
هـــەمـــووی ڕازاوەی ئـــەلتـــافی تۆیـــە
هـــەر بـــە لـــوتفی تـــۆ بـــە ڕەنـــگ و بۆیـــە

١٢. داررووی نۆش: واتە نۆشدارروو، یانی: (تریاق): کە کەڵە کێوی مار پێوە ئەدا ئاو بە چاویا دێتە خوارەوە ئەو ئاوە لە ناو قوولکەی بەردەمی چاویا کۆ ئەبێتەوە و وشک ئەبێتەوە، بەو ئاوە وشکە ئەڵێن (تریاق) هەر کەسێ بیخوا زەهریمار کاری تێناکا.

پـــــەروەردگـــــارا لوتفـــــت كافييـــــە
بـــــۆ دەردی دڵـــــم دەوای شـــــافييە
(نـــامی) بـــە لوتفـــت پـــەنـــا ئـــەهێنـــێ
تـــاوانی لـــــە لای لوتـــف ئـــەنوێنـــێ

## الخبير

پـــەروەدگـــارا خـــەبـــيری ئـــەحـــواڵ
ڕەســا و نــاڕەســا نوقــسان و كـــەمـــاڵ
ديـاره شـەخسی مـەوسـووف بـە نوقـسان
بـــێيارمـــەتی تـــۆ ناگـــا بـــە ئيحـــسان
ئـــەوەی كـــە بيكـــا لـــە خێـــر و تاعـــەت
بـــە ئيخلاســـی دڵ لـــە ڕێـــی ســـەعـــادەت
نمـــێ لـــە هـــەوری ڕەحمـــەتی تۆيـــە
كـــەمـــێ لـــە دەريـــای نيعمـــەتی تۆيـــە
نـەقـسێ ڕوو نـادا لـە خـەزانـەی غـەيـب
بـە تاوانبـاری شـەخـسی پـڕ لـە عـەيـب
زيـــاديش ناكـــا دەريـــای ڕەحمـــەتـــت
لـــە تاعـــەت كـــاری هـــەمـــوو ئوممـــەتـــت
ســـا بـــۆ خـــاتری ئـــەو ئيـــستيغنايە
بـــۆ بـــەرزی پايـــەی ئـــەو كيبريايـــە
(نـــامی) هـــاواری هێنـــاوەتـــۆ بـــۆت
ببيـەخـشه بـە بـۆی ئيحـسانەكـەی خـۆت
تـا بـە سـەربـەرزی لـە ڕۆی مـەحـشەرا
بـڕوا لـە پـەنـای مـەولای بـەشـەرا

## العظيم

یــا خـــودای عـــەزیـــم، یـــا عظـــیم الـــشأن
یـــــا عظـــــیم العــــــرش حــــــی لامکــــــان

یــا مــەوجــوودی حــەق (واجــب الوجــود)
پڕتــەودەر لــەبــۆ عالــەمــی (شــــهود)

بــەری لــە (قیــود) موتــڵەق لــە تــەعریــف
(مختــار فــی الفعــل) مــەرجــەعــی تــەکلیــف

وکـــــل یـــــوم هـــــو فـــــی شـــــأن
شـــــأن الافعـــــال العلیـــــا الحــــــسان

بــەبــێ کــات مــەوجــوودی لــە هــەمــوو کاتــا
بــێمــەکــان مــەوجــوود لــە کائیناتــا

بــەبــێ حولــوول و ســـیرایەت لــە (شــیء)
موجـــود مـــع العـــین و العـــرض والفـــیء

کــەس مــاوای نییــە ســەر بێنێتــە دەر
نــابوودێ دەرکــا و بێکــا بــە ئــەســەر

مــەگــەر زاتــەکــەی (واجــب الوجــود)
خــەللاقــی عالــەم بــە ڕاســتی مــەعبــوود

نیـــسبەتی ئاســار بــۆ غــەیــری خــودا
لــە هــەر شــوعووری ببــێ هــوەیــدا

هـــەر نـــەفامییـــە و نـــاپوختی پــەتی
لــە پــەت بــەر بوونــە و لــە بــەدتینــەتی

ســـواری ئـــەســـپی ڕووتی هـــەوایـــە
نیـــسبەتی ئیجـــاد لـــەو ماســـیوایە

قەت لەبۆ ئەسباب دامەنێ (تأثير)
(تأثيرات) حەسرە لە خودای قەدیر

## الحي

(یا حی) بەزاتت ئەزانم کە هەی
دووری لە هەرچی فیکری بۆ بکەی
نە نوور نە ئەسیر نە هەتاو نە (فیئ)
هەر خۆت ئەزانی بە خۆت هەرچی هەی
(باطن) بە (ذات) و (ظاهر) بە (آثار)
ئەووەڵ و ئاخر (على الاعتبار)
ئەگەر تاوانم زۆرە و عەزیمە
شەپۆ لی دەریای عەفوت عەمیمە
تاوانی گەورە لای خودای گەورە
وێنەی نمێکە لە دەریای دەورە
هیوام بە زاتت وایە بمپۆشی
شەرابی ئیحسان بە دڵ بنۆشی

## الغفور

ئەی (غفور) لەبۆ گشت تاوانباران
بێجگە کافران خەسارەتکاران
بە فەیزی ئیحسان کەرەم بفەرموو
مەشموولم بکە بۆ ڕەحمەکەی زوو
کە عوفت کردین عەفوێ وەها بێ
نیشانەی ڕەحمی تۆی لەگەڵا بێ

ئـــەوەی مـــەقبوولـــی بـــارەگـــای تۆیـــە
لـــە ڕۆژی ڕەشـــا بـــە ڕەنـــگ و بۆیـــە

## الشكور

شـــەکـــوورە یـــانی وەرگـــری ســـوپاس
لـە شـەخـسی دڵـپاک خـاوەنی ئـیخلاس
مـــەعبـــوودی هـــەمـــوو عیبـــادەتکـــاران
بـــە ئیخلاســـــی دڵ لــــە ڕۆزگـــــاران
واجـــبی (ذمــــــە)ی خـــاوەن ئیخلاســـــە
سوپاســی خــودای عامــە و هــەم خاســە
چلـــۆن هۆشـــێکە هۆشـــی بـــێهۆشـــێ
بـــۆ سوپاســـی تـــۆ بــە دڵ نـــەکۆشـــێ

## العلی

(یـــا علـــی) عـــالی بـــە زات و ســـیفات
(فیـــاض)ی نیعمـــەت لـــە ســـەر کائینـــات
ســـاحەی ســـینەکـــەم بـــە وێنـــەی ســـینی
خالـــییە ئـــەگـــەر کـــەرەم نـــەنـــوێنی
تینـــــــــــووی زولالی ئیحـــــــــــسانی زاتم
نمـــێکم بـــەســـە مـــاوەی حـــەیـــاتم
دەی لــــە بـــارانی بـــەهـــاری ســـامی
نمـــێ بنێـــرە بـــۆ ســـینەی (نـــامی)

## الكبير

پـــەروەردگـــارا پادشـــای ئـــەکبـــەر
خـاوەن دەســتەڵات لـە سـەر بـەحـر و بـەڕ
بـە مـەحـزی ڕەحمـەت (بعثــت الرســل)
بــە فــەیــزی نیعمــەت (کــشفت الــسبل)
هــەر لــە ئــەزەلــدا بــەســتووتە پــەیمــان
ڕێگـــەی ڕزگاریـــت نیـــشان دا پێمـــان
مـــادام (موافـــــق) وەرامـمـــــان داوە
بـــا تـــەوفیقـــەکـــەت بێتـــە ئـــەم نـــاوە
(نــامی) بــە تــەوفیــق ئــەبــێ بــە ســامی
بـە زەوقـی ئـەشـقی (مـەولانـای جـامی)[13]

## الحفيظ

یـــا (حفـــیظ)ی دڵ لـــە داوی شـــەیتـــان
یـــا (حـــافظ)ی ڕۆح لـــە هـــەوای توغیـــان
بمانپـــارێزە لـــــە بـــــای مــــەنـــاهی
بـــا نـــەچینـــە ســـەر ڕێگـــەی گـــومراهی
ئـــەمینمـــان بکـــە بـــە میهـــرەبـــانی
لـە ئـەمـری نـەفـس و کـاری شـەیتـانی
مـەخـسووس ئـەو کاتـە ڕۆح پـەرواز ئـەکـا
کاتـــێ عـــەزرائیـــل بانگـــەواز ئـــەکـــا

١٣. مەولانای جامی فەرموویەتی:
بحمدالله تا بودم در این دیر به راه عاشقی بودم سبک سیر
واتە: سوپاس بۆ خوا تا لە دنیادا بووم، بە ڕێگای عاشقیدا سووک و سۆڵ بووم.

لــە ڕووی ئــەم دونیــا دەرئــەچــێ بــە دڵ
لــە گــۆڕێ تــەنگــا ڕائــەگــرێ مــەنــزڵ
بــا فریــشتەی خــەیــر هــاوارازی دڵ بــێ
چــرای پــیرۆزی نــووری مــەنــزڵ بــێ

## المقيت

پــــەروەردگـــارا ڕاســـتە (مقيـــت)ی
(حــافظ) و (شــاهد) (محيــی) و (مميــت)ی
تــــۆ کائیناتـــــت هێنایـــــە وجـــــوود
یــانی غــەیــری تــۆ نابــێ بــە مــەعبــوود
عیبـــــادەت ناشـــــێ (الا) بــــۆ (خــــالق)
ذلـــــک الحکـــــم مـــــن الحقـــــائق
انـــــی آمنـــــت بـــــالله الکـــــريم
صـــــاحب الفـــــيض العظـــــيم العمـــــيم
فـــــاغفرلی ذنبـــــی واقبـــــل تـــــوبتی
واغـــــسل بمـــــاء الرضـــــا حـــــوبتی[١٤]
لە هەرچی هــەرکــەس خــاوەن نیعمــەت بــێ
یــا بــۆ دامــاوێ مایــەی ڕەحمــەت بــێ
هــەمــووی بــە فــەیــزی ئیحــسانی تۆیــە
ئــەگــەر قــەدیمــە یــا چــەرخــی نۆیــە
(نــامی) کــەوتــووە لــە بــەر دەرگــادا
ڕێـــزەخۆرێکـــە لـــە بـــارەگـــادا

---

١٤. حوبة: گوناهـ.

## الحليم

ئــەی پــەروەردگــار ڕەحمـــان و ڕەحـــیم
(ودود) و (رووٌف)، (صــــبور) و (حلـــــيم)
خـــاوەن حـــەوســـەڵـــە، بـــۆ تاوانکـــاران
تـــــا وادەی دیـــــاری لـــــە ڕۆژگـــــاران
بـــەو حیلمـــە کـــەوا بـــووە بـــە لـــەنگـــەر
بـــۆ حیفـــزی دوژمـــن بـــووە بـــە ســـەنگـــەر
حیلمـــــــت دەوای دڵ ئـــــەهێنێتـــــەوە
قـــارت زامـــــی دڵ ئـــــەکولێنێتـــــەوە
بەو حیلمەت کـە دات بـە قـەلبی خـەلیـل
بـــۆ ســـەر بـــڕینی ڕۆڵـــەی، ئیـــسماعیل
بـەو سـەبـرەی کـە دات بـە دڵـی ئـەیـووب
هــەتـا گــەیـشته مونتــەهـای مــەتلـووب
بــەنــدەی تــۆ (نــامی) پێــوەنــدی دەردە
پووکـــاوەی هـــەوای هـــەناســـەی ســـەردە
دڵ پووکـــاوەیـــە بـــە ســـەردی جـــەفـــا
ئـــەپارێتـــەوە بـــۆ ســـروەی ســـەفـــا
دڵـــــی پـــــڕژاوە بـــــە شـــــەرارەی دەرد
بـە ڕەشـەبـای شـەڕ پـڕ بـووە لـە گـەرد
بـا شـنۆی شـەمـاڵ دابـێ لـەسـەردا
تـــۆزی دڵ ببـــا بـــە هـــەرداوهـــەردا
(نـــامی) لابـــدە لـــە ڕەشـــەبـــای دەرد
دڵ پـڕ لـە نـوور بـێ و دەمـاخ پـڕ لـە وەرد

## الحسيب

ئـــەی پـــەروەردگـــار نیگابـــانی عـــام
زانـا بـە ئـەسـرار لـە لای خـاس و عـام
غـەیـب و شـەهـادە، لای تـۆ یـەکسانن
خـەفایـای ئومـوور لای تـۆ عـەیـانن
مـادام سـەمـاوات لـە (مطويـات)ە
ئـەرزیـش لـە قـەبـزەی قـودرەتی زاتـە
قـەت شـتێ نییـە لـە تـۆ پـەنهـان بـێ
لـەم جیهانـە بـێ یـا لـەو جیهـان بـێ
مـادام عـالیمی بـە عـەیـب و عـارم
زانـای بـە ئـەخفـای ئـەسـراری کـارم
بـە ڕەحمـەتی خـۆت ببـەخـشە (نـامی)
لـە بـەر حورمـەتی دیـنی ئیـسلامی

## الجليل

ئـەی پـەروەردگـار (مبـرأ) لـە عـەی
لـە سـەر عالـەمـی شـەهـادەت و غـەیـب
سـیفاتی سـەلـبی جـەلالی زاتـت
دەلـیلن لـەبـۆ بـەرزی سـیفاتت
هەر تۆی (ذوالجلال) هەر تۆی (ذوالاكرام)
هەر تۆی بەڕاستی مـەوسـووف بـە ئینعـام
هـەرچـی نیعمـەتێ وا لـەم جیهانـە
هـەمـووی سـەرچـاوەی عـەینی ئیحسانە

(نـــامی) ببــەخـــشە کـــە تاوانبـــارە
بـۆ فـەیـزی ڕەحمـــەت بــە ئینتیــزارە

## الكريم

کـەریم سـەرچـاوەیـت بـۆ فـەیـز و کـەرەم
تـۆی (مـــشتقمنـــە) بـۆ نـووری ئـادەم
هـــەر کـــەرامـــەتـــێ دەرچـــێ لـــە دونیـــا
لـە سـەمـا لـە ئـەرز لـە بـەڕ لـە دەریـا
هــــەر خوانــــێ کــــەوا کرابێتــــەوە
گیانــداری لـــە ســـەر گـــرد ببێتــەوە
هــەر خێــرێ ببــێ بــە هــەر بــارێ بــێ
بـــۆ بـــێدڵ یـــاخۆ بـــۆ دڵـــدارێ بـــێ
هـــەمـــووی کـــەرەمـــی زاتی کـــەریمـــە
هـەمـووی لـە کـانی فـەیـزی عـەمیمـە
یاســـــای فیعلیتــــــە پــــــەروەردگــــــارا!
شـــوئوونی فیعلیـــــت لـــــە ڕۆزگــــارا
تعــــــز و تـــــــذل تعطـــــــی و تمنـــــع
تحیــــــی وتمیـــــت تخفــــــض و ترفــــع
(نـــامی) تـــا مـــاوە ئـــەپاڕێتـــەوە
بـەڵ قـــاپی خــەیــری بـــۆ بکرێتـــەوە

## الرقيب

ئـەی خـودای ڕەقیــب ئاگــادار لــە حــاڵ
زانـــا بـــە بـــیر و بـــاوەڕ و ئـــەعمـــاڵ

بـێ تـەوفیقـی تـۆ قـەت نابـێ کـارێ
بـێیارمـەتی تـۆ سـەرنـاچی بـارێ
بـە میهـرەبـانی خـودای میهـرەبـان
لامـان دە لـە شـەڕ خـودای نیگابـان

## المجیب

ئەی خـودای (مجیـب) بـۆ حاجـەتمـەنـدان
لـەبـۆ سـکالای گـشت دەردمـەنـدان
بـۆ دامـاوانی ڕۆزگـاری ڕەش
بـۆ گـەدایـانی بـێپـارە و بـێبـەش
بـۆ پـەشـیمانان لـە ئـۆفی تـاوان
بـۆ دەردمـەنـدی فرمێـسک بـە چـاوان
بـۆ دایـە و بابـەی جـەرگ و دڵ بوریـان
بـۆ هیجـرانبـاری دوو دیـدە گریـان
بـۆ دۆسـت و بـرای لـە یـەکتـر بـڕاو
ئـاگر تێبـەربـوو لـە جـەرگ و هـەنـاو
بـۆ موخلیـسانی خـاوەن عیبـادەت
بـۆ تالیبـانی ڕێگـەی سـەعـادەت
بـەو ڕەحمـەتـەی وا ئـەوەنـد گوشـادە
دڵـی تاوانبـار مـەسـروور و شـادە
بـە ئیحـسانی خـۆت لوتفـێ بفـەرمـوو
سـکالای (نـامی) قـەبـووڵ بکـە زوو

## الواسع

پــــەروەردگـــــاری (واســــــع الرحمـــــــه)
(فیــاض)ی موتــڵەق بــۆ هــەمــوو نیعمــه
یـــــا مـــــــن وســـــعت حقــــا رحمتــــــه
کمـــــــا وســــــعت حقــــــا نعمتـــــــه
گوشــــادکەرەوەی دڵـــــم بـــــه ئیحــــسان
بــۆ خدمــەت کــردن بــه دیــنی ئینــسان
لـــــه تـــاریکی دڵ لـــــه بـــــەرچاوتـــــەنگـــی
ڕزگـــارم بکـــــه وەکـــوو دەســــتەنگـــی
ســاحەی ســینەکـــەم بکـــه بـــه کورســـی
لــەبــۆ تــەجــەلــلای ئــەنــواری قودســی
تـــا ســـوود وەربگـــرم لـــه ژیـــانی خـــۆم
بۆ خــەیری خــەڵکی و بــۆ ئیمــانی خــۆم

## الحکیم

پـــــەروەردگـــــاری زانـــــای تـــــەوانـــــا
حـــاکم لـــــه عـــــەرزا و لـــــه ئاسمانـــــا
ئەی خاوەن حیکمەت بێعــەیــب و توهمــەت
لــه قــەبز و بــەسـتا بــۆ خێــر و نیعمــەت
کـــار و وتـــارم بـــــه فـــــەیـــزی ڕەحمـــــەت
برازێنـــــەوە بـــــه ســـــیرڕی حیکمـــــەت
چ لـــــه ئـــــەفکـــارا و چـــــه لـــــه کـــردارا
حیکمـــــەت دارم کـــــه لـــــه ڕۆژگـــــارا
بـــێحیکمـــــەت مـــــەکـــه واتـــــه و کـــردارم
لــه ئاســاری ســووک زۆر شــەرمــەســارم

کە حیکمەت جێی گرت لە دەشتی دڵم
واتەی دەم ئەبێ بە بەستەی گوڵم
لە حیکمەتی تۆ هەر کەس بەشدارە
خاوەن ئەنواری ڕووی ڕۆزگارە

## الودود

ئەی پەروەردگار خالیقی مەعبوود
(ودنی أنت الرؤف الودود)
مەحبووبی لای تۆ خاوەن عەلەمە
چونکە مەحبووبی هەموو عالەمە
کە مەحبووبت بوو ئەبێ بە (محب)
بۆ حوببی زاتت ئەبێ بە (طالب)
حوببی ڕەهبەر و کۆمەڵی یاران
ئەبێ بە بەهرە بۆ ڕۆزگاران
هەروا (تابعین) تا ئەولیای دین
(رضی الله عنهم أجمعین)
نامێنێتەوە کەسێ لەم دونیا
حوببی پێنەگا (حتی) لە دەریا
ئەو حوببەیش ئەبێ بە حەببەی ڕەحمەت
بۆ حەوت و حەفتا و حەوسەد لە نیعمەت
دین مەحەببەتە بۆ خودای عالەم
بۆ پێغەمبەران ئادەم تا خاتەم
بۆ گەلی یاران ئەووەڵ و ئاخر
خاوەن کەرامات (باطن) و (ظاهر)

بــــۆ هـــــەر ئینــــسانێ لــــە کائیناتـــــا
بــە حــەق بــەشــدار بــێ لــە نــاو خێراتــا
ئــەم مــەحــەبیــەتــە هاتــە جــێ بۆمـــان
ئــەبــین بــە خــاوەن بــۆ دیـــن و ئیمـــان
(نـــامی) بــە ســەفــای مــەحــەبیــەت ئــەژی
ئینــسانی بــێ حــوب یــاخوا هــەر نــەژی

## المجید

انـــــت المجیــــــد ذو المجـــــــد العظـــــــیم
انـــــت الکـــــریم بـــــالفیض العمـــــیم
زەڕڕاتی عالــەم بــێ قــەیــد و تــەحدیــد
بــبن بــە زمــان ناگــەن بــە تــەمجیــد
ڕەحمـــێ، کـــەرەمـــێ، ئێمـــە دامـــاوین
بــە گــەرمــای دەشــتی دووری ســووتاوین
موحتــاجین بــە حــەق بــۆ شــەمالــی ســەیــر
بــۆ یارمــەتیمــان بــۆ ســەفــەری خــەیــر
(نـــامی) لــە دەریــای مــەجــد و کیبریــا
نمێکــی بــەســە بــۆ هــەر دوو دونیـــا

## الباعث

ئــەی پــەروەردگــار (باعـــث)ی ئــەمــوات
زیندووکــــەرەوەی مــــردووی کائینـــــات
خـــۆت ئاگـــاداری بـــە حالـــی دڵـــمان
بـــە ئـــاهی ســـەرد و دەردی موشکـــڵمان

دڵـــێ مردبــێ خـــەبـــەردار نییـــە
بــۆ ئـــەدای (واجـــب) ئاگـــادار نییـــە
نمــێ لــە هــەوری بــەهــاری ڕەحمـــەت
کافییـــە بــۆ دڵ بــۆ بـــەرزی هیممـــەت
شــنۆی نــەســیمی ئــیرادەتمــەنــدی
بــەســە بــۆ ســەفــای ســەعــادەتمــەنــدی
(نــامی) بــەو نمــە و بــە شــنۆی نــەســیم
نــەشــئەدار ئــەبــێ بــۆ یاســای تــەسلیم

## الشهيد

پـــەروەردگـــاری قـــەریـــب و بـــەعیـــد
وعلـــــى كـــــل الاشـــــياء شـــــهيد
حـــازر و نـــازر ئـــەڕوانـــێ بۆمـــان
دەی ڕزگارمــان کــە لــە نــەفــسی خۆمــان
لــە گــەردەلــوولی بــای دونیــای دوونــا
مــەمانـــدەرە لای بـــای تووناوتوونـــا
ئـــەپاڕێمـــەوە لـــە پایـــەی دەرگـــات
فــڕەمــان مــەدە بــۆ چــای دەرەکــات
ئـــەوەی شـــیاوە بـــە ئیحـــسانی خـــۆت
بیـــدە بــە بــەنــدەی ناتــەواوی خـــۆت
تـــا بێتـــە ڕیـــزی کۆمـــەڵـــی (نـــامی)
بگـــا بـــە فـــەیـــزی بـــارەگـــای ســـامی
ئـــەوەڵ تـــا ئـــاخر (نـــامی) ڕاجییـــە
بڕواتـــە ڕیـــزی فیرقـــەی ناجییـــە

## الحق

یا حەق تۆ بە حەق پەروەردگاری
سەرچاوەی ئاوی دەریا و ڕووباری
(واجب الوجود) خاوەن کەماڵی
بێعەیب و نوقسان شیرین جەماڵی
بە حەقی کونهی زاتی حەق خۆت
بەو جیلوەی ڕەحمە سابتە لەبۆت
(مطمئن) بکە دڵمان بە زیکرت
بیکە بە مەرکەز بۆ فەیزی فیکرت
(نامی) لابدە لە ڕەشەبای شەڕ
بیکە بە مەزهەر بۆ ئیحسان و فەڕ

## الوكيل

(نعم الوكيل)ی ئەی پەروەردگار
بۆ تەوەککولدار بۆ دڵ خەبەردار
من يتوكل عليك حقا
لا يلقى الا خيرا ما يبقى
دەرم کە لە بای ئەوهامی تەعلیل
تا بە دڵ بڵێم تۆی (نعم الوكيل)
تا نزام بگا بە بارەگای تۆ
ببم بە (خادم) بۆ بەر دەرگای تۆ
تا بڵێم لە سەر یەقینی دڵم
لە دەشت و سارا و ماڵ و مەنزڵم
رب اشرح صدری و يسر أمری
و نور قلبی و بيت قبری

**حتـــــی أقـــــول قـــــولا بالحـــــب**
**فـــی الحـــشر نعـــم الوکیـــل ربـــی**
واتـــە ســـابت بم لـــە ســـەر ئیـــسلامی
**(انـــک أنـــت الحـــافظ الحـــامی)**

## القوی

خـــەللاقـــی عالـــەم قـــەوی بـــە قـــودرەت
خـاوەن عیـززەت و هـەیبـەت و نـەسـرەت
مـــەوجـــوودات هـــەمـــوو بـــە قـــودرەتی تـــۆ
وجـــوودی وەرگـــرت بـــە وێنـــەی شـــەوبـــۆ
ســـــوورەتی عیلمـــــی زاتی ئـــــەزەلی
وەری‌گـــرت وجـــوود لـــە (لـــم یـــزل)ی
بۆنـــێ لـــە باغچـــەی ڕەحمـــەتی تـــۆدا
(نـامی) بـاش ئـەنـوێ لـەگـەڵ شـەوبـۆدا
ڕۆح و جیـــسم و دڵ حـــەواســـی هوشـــیار
بـــە قـــووەتی حـــەق دێنـــە ســـەر ئاســـار
زەڕڕاتی عالـــــەم بـــــێ‌ئـــــیرادەی تـــــۆ
نابـــێ بـــە خـــاوەن بـــوون و ڕەنـــگ و بـــۆ
دڵ بـــێ‌تـــەجـــەلـــلای ئـــەنـــواری زاتـــت
بـــەش وەرنـــاگرێ لـــە بـــەرەکاتـــت
بـــە هـــەمـــوو بـــارێ زەعیفـــە حاڵـــم
دڵـــم دەروونم ســـەرشـــان و باڵـــم
دامـــاوی شـــوعلەی ئـــەنـــواری زاتم
موحتـــاجی جیلـــوەی ســـەفـــای ســـیفاتم

بــە ئیحـــسانی خــۆت پــێمبــدە قــووەت
تــا (نــامی) بــژی لــەگــەڵ مــرووەت
تــەلبیــسی ئیبلــیس دوور خــەرەوە لــێم
تـا لـەگـەڵ تـەقـدیس بـۆ حـوزوورت بـێم
(نـامی) نامـەی خـۆی وێنـەی عـەرز و حـاڵ
لــەگــەڵ ســکالا و دامــاوی ئــەحــواڵ
پێــشکەشــی ئــەکــا بــە بــارەگــای تــۆ
بـە هـۆی ڕەهبــەری عالــەم کۆنــە و نــۆ
ئومێــــدم وایــــە بــــاش وەریبگــــرێ
تــا (نــامی) ڕێگــەی ڕزگــاری بگــرێ
ئــەوســا بــەڕاســتی زینــدووی ئــەبــەدە
مــەحبــووبی زاتی فــەردی ســەمــەدە

## المتين

یــــا ربــــی یــــا ذا القــــوه المتــــین
انــــت الالــــه المبــــین المعــــین

بــە مــەتانــەتی قــووەتــەکــەی زات
(نــامی) دوور بخــە لــە بــای (ســیئات)
نــەلــەخــشێتەوە بــە نــەخــشەی شــەیتــان
تــا چــڵکن نــەبــێ بــە درۆ و بوهتــان

## الولي الوالي المتعالي

پــــەروەردگــــاری خــــاوەن تــــەالــــی
انــــت الــــولی و انــــت الــــوالی

**یـــــا متعـــــــالی فـــــوق العـــــوالی**
**مـــــنکم و لکـــــم کـــــل المعـــــالی**

تـۆی (ولــی) لـه سـەر مـەعنـای ویلایـەت
تـۆی سـەرپـەرشـت و خـاوەن عینایـەت
تـۆی (متــولی) بـۆ ئـەفـرادی خـەلـق
بـۆ تـەمـێ و تـەعلـیم بـۆ تـەربیـە و ڕزق
وەلی و ســەییــدی هــەمــوو عیبــادی
والی و ســەرچــاوەی ڕوشــد و ئیرشــادی
وەلی و ناســـری بـــۆ (مستنـــــصرین)
دۆســتی بــەڕاســتی بــۆ (مستبـــصرین)
مــەولا و مــوعتیقی ڕیقــابی ئــەشــرار
بـــۆ تاوانبـــاران دەســـتەی گوناهبـــار
بــە حــەقــی ســیرڕی ویلایــەی زاتــت
بـە حـەقـی جیلـوەی ئـەسمـا و سـیفاتت
(نـــامی) ببـــەخــشە لــە تاوانبـــاری
تــا بێتــە حــوزوور بــێ شــەرمــەساری

## الحمید

حــەمیــدی لــە ســەر ئیــستیحقاقی زات
عــەلاوەی جیلــوەی پرتــەوی ســیفات
مــەعبــوودی بــە حــەق لـەبـۆ عابیــدین
مـەحمـوودی بـە حـەق لـەبـۆ حامیدیـدن
**یـــا مـــن فـــی کـــل فعـــال محمـــود**
**انــــت المحمـــود و أنـــت المقـــصود**

لــە هــەر مــەنبــەعــێ نمــێ لــە ڕەحمــەت
کــە بێتــوو بگــا بــە ئــەهلــی نیعمــەت
هــەمــووی ئیحــسانی (بالــذات)ی تۆیــە
هــەمــووی لــە جیلــوەی ســیفاتی تۆیــە
یــانی بــە (فــەیــضی) (واجــب الوجــود)
گـــەیـــشتە عالـــەم خـــەلاتی وجـــوود
پێـــوەنـــدی قـــودرەت لـــە مومکیناتـــا
بـــوو بـــە هـــۆی وجـــوود لـــە کائیناتـــا
ئیمکـــــانی مـــــومکین لازمـــــی زاتـــــە
عیللـــــەتی نـــــاوێ بـــــەدیهییاتـــــە
ئـــەم ئیمکانـــەیـــە وەســـیلەی نیـــاز[15]
بـــۆ لای خـــەللاقـــی عالـــەمـــی مومتـــاز
حـــودووس و زوهـــوور ئـــەنجـــامی خـــەڵـــقە
تـــەئخـــیری مـــەعلـــوول لـــە عیللـــەت حـــەقـــە
جـــا لـــەبـــۆ پاســـی ئاســـاری ئیجـــاد
بـــوو بـــە نیگابـــان بـــۆ هـــەمـــوو عیبـــاد
قـــاهیرە لـــە ســـەر ســـەری ســـتەمکـــار
ئـــەمـــڕۆ یـــا ســـبەی لـــە ســـەر ئینتیـــزار
یاســـای عـــەداڵـــەت (ســـنە الله)یـــە
ســـوننەتی هـــەقـــە هـــەتـــا هـــەتایـــە
(مبـــدیء)ی ڕشـــتەی ئـــادەمیـــی هـــەمـــوو
بـــە ئـــیرادەی حـــەق زاتی ئـــادەم بـــوو

[15]. نیاز: مەبەس لە نیاز لێرەدا پێویستییە.

هەروا بەینابەین بۆ تەمیزی عەین
ڕەهبەریکت نارد ئەکەوتە مابەین
هەتا خاتەمی هەموو ئەنبیا
موحەممەد ئەحمەد مەولای ئەسفیا
کردت بە خاتەم بۆ پێغەمبەران
کردت بە ئەکرەم لە سەر سەروەران
(نامی) یەکێکە لە ئوممەتی ئەو
پەپوولەی شەمعە و عاشقی پرتەو
وا لە دەرگایا ئەسووڕێتەوە
تۆزی عەتەبەی ئەسڕێتەوە
نمێ لە ئاوی حەیاتی ڕۆحی
پێبدە لەبۆ نەسر و فوتووحی
تا بەردەوام بێ لە بارەگادا
عەتەبەبۆس بێ لە بەر دەرگادا

## المحصی

تۆی (محصی) لەبۆ هەموو کائینات
چ لە ئەرزا بێ و چ لە سەماوات
تکەتکەی ئاو یا قەترەی باران
پایز و زستان یاخۆ بەهاران
گەڵای دارەکان گیای سەرزەوی
مادەی مەوجوودات لە بەرز و نەوی

هەمووی لە لای تۆ مەکشووفە و مەعلووم
زاتی مەوجوود و مەفهوومی مەعدووم
لەگەڵ ئەمەشا نیعمەتت وایە
نیعمەتت بۆ عام دوور لە ئیحسایە
سا خوا بە حەق عموومی عیلمت
بە حەقی لوتف و کەرەم و حیلمت
بە خامەی کەرەم لە بارەگای زات
لادە لە نامەم شوومی (سیئات)
بە ئیحسانی خۆت لە سەر دەرەجات
(سیئات)ەکەم بینە (حسنات)
هیوام بە فەیزی ئیحسانت وایە
مەقبووڵ بێ لە لات ئائەم ڕجایە
بەڵ بە ڕووناکی دەروون و دڵم
وەربگرم بۆ خۆم جێگا و مەنزڵم

## المبدیء المعید

ئەی (مبدیء) لەبۆ هەموو مەوجوودات
خالیقی مەوجوود لە ڕووی سەربسات
پەروەردگاری ئەجزای کائینات
ئەمرێنی هەموو ئەربابی حەیات
هەموویش بە یاسای عەدالەتکاری
دێنەوە وجوود بە ئەمری باری
بۆ حیسابی حەق بۆ میزانی داد
بۆ (مکلفین) لە هەموو عباد

زات و سیفات و (استعداد) هەموو
بە قودرەتی تۆ بۆیان پەیدا بوو
وەکوو ئیبدایە هێزی ئیعادە
بێفەرقە لای تۆ ئاسان و سادە
یا من لا یضر ملکه الذنوب
ولا بالعفو ینقص محبوب
لە ئازاردانم دەرناچێ سوودی
لە تاوانبەخشیم مەوجوودە جوودی
دەی بە ڕەحمی خۆت ببەخشە (نامی)
تا بمرێ لە سەر یاسای ئیسلامی
تا بە سەربەرزی بە زەوقی (شوهوود)
لە سایەی لیوای سەییدی مەسعوود
بخوێنێتەوە بە ئاوازی بەرز
سەنای پرسەفای سولتانی سەر عەرز

## المحیی المیت

یا (محیی) لەبۆ هەموو گیانلەبەر
(حاشر)ی ئەموات لە ڕۆژی مەحشەر
ویا ممیت الأحیاء طرا[١٦]
غنیا اولا عبدا أو حرا
أحی بالفیض العمیم قلبی
حتی اطیع بالقلب ربی

[١٦]. طرا: عامە: بە گشتی.

امـــــــت مـــــــانعی لـــــــــسعادتی

حتـــــــی أقـــــــوم بالعبـــــــاده

تـا بـەنـدەت (نـامی) زینـدوو بـێ بـە دڵ

لـەگـەڵ زیکـری تـۆ بگـا بـە مـەنـزڵ

هـەر بـە تـۆ ئـەکـرێ ئـەحیـا و (اماتـە)

هـەرچـی مـومکین بـێ لـە مـەقدووراتـە

## الحي القيوم

یـا (حـــی) تـــۆ زاتی زینـــدوو بـــە زاتی

بـــێمـــادە و مـــەزاج خـــاوەن ســـیفاتی

یـا حـی یـا قیـوم یـا قـائیم (بالـذات)

موحتـــاجن بـــە تـــۆ هـــەمـــوو کائینـــات

وەسـفی حـەیاتـت ئـەزەڵ تـا ئـەبـەد

ئـــەدرەوشـــێتەوە بـــێئـــەنـــدازە و حـــەد

(قیـــوم)ی قـــائیم بـــە زاتی بـــۆ خـــۆ

(مقـیم)ی بـۆ غـەیـر عـەیـن و ڕەنـگ و بـۆ

قـــەییومیـــت مایـــەی قیـــامی عـــەرشـــە

قیـامی کورسـی و سـەمـا و سـەر فـەرشـە

قـــــەیـــــووم نـــــاوێکی زاتی خودایـــــە

داخلـــی ڕشـــتەی ئـــەسمـــای حوســـنایە

قـائیمی (بالـذات) مـوقیم لـەبـۆ غـەیـر

مەعنای قـەییوومـە و مـەنبـەعـە بـۆ خـەیـر

ئـــەو موبالـــەغـــە لـــەم مـــەعنادایـــە

لایقـــــــی زاتی پـــــــاکی خودایـــــــە

بۆیــە ئــەفــەرمــوون ئــەربــابی کــەمــاڵ
قــەیــووم (مختــتص)ە بــە خــوای زوالجــلال
دەی یــا قــەییــومی هــەمــوو کائینــات
عەرش و کورسی و لەوح عـەرز و سـەماوات
بمانپـــارێزە لـــە کـــوفر و بیدعـــەت
هـەتـا سابت بـین لـە سـەر شـەریعـەت
لـە سـەر ئـەو شـەرعـە بـڕۆین بـە ڕێـدا
بـــە نوورێکـــەوە ببـــێ لـــە جێـــدا
بمانپـــارێزە لـــە دوژمـــنی دیـــن
بمانهێـــڵەوە بـــە هێـــزی تـــەمکـــین
بـــبین بـــە مایـــەی پـــیرۆزی خۆمـــان
بــۆ دیــن و دونیــا بــۆ ئــەمــن و ئیمــان
بـە تـەوفیقـی کـار بـە ئیرشـادی عـام
بە سـەرفی مـەعنـای لـەبـۆ (خـاص) و عـام
لــە کــانی (ذل)دا (نــامی) ئــەجۆشــێ
بـۆ عـەفـوی خـەتـا بـە دڵ ئـەخرۆشـێ
دەرمـــانی دەردی بـــاتین و زاهـــیر
هــەر لــە لای تۆیــە قــەییــوومی قــاهیر
بــە ڕەحمــەتی خــۆت کــەرەم فــراوان
(نــامی) ببــەخــشە لــە تــۆفی تــاوان
تــا بــە ســەربــەرزی بـڕوا بـۆ مــەحــشەر
بـۆ ژێـر بـەیـداخی سـەیـیدی بـەشـەر
بــڕژێ بــە ســەریــا لــەم ڕووی دونیایــە
دروودی خـــودا هـــەتـــا هـــەتایـــە

هەم لە سەر ئال و یارانی یەکسەر
لە سەر ئەتباعی تا ڕۆژی مەحشەر
لە هەموو ئان و سەعات و سالێک
بە هەموو شێوە و ڕەنگ و ئەحوالێک

## الواجد الماجد

ئەی خودای واجید بۆ عەینی مەقسوود
چ لەبۆ ئەحمەد چ لە بۆ مەحموود
مەقسوودت چی بێت حازرە لە لات
چ لە عەرزا بێ و چ لە سەماوات
مەقسوودم فەوزی نیعمەتی تۆیە
مەقسوودم لەوەیش ڕەحمەتی تۆیە
بە (فیاض)ی خۆت ئەی خاوەن ڕەحمەت
(نامی) بەش بدە لە عیلم و حیکمەت
خاتیمەی حوسنای بکە بە نەسیب
انک انت القریب المجیب
ماجیدی بە حەق (ذوالمجد الرفیع)
هەر لەبۆ تۆیە ڕەحمەتی وەسیع
(نامی) بەندەکەی دەم بە دوعایە
دوعای بۆ ڕەزای کاتی لیقایە

## الواحد

واحیدی تەنیای بە زات و سیفات
بێوێنە و میسلن لە ڕووی کائینات

هاووێنـــەت نییـــە لـــە نـــەفـــسی زاتـــا
بـــێمیـــسلی لـــە ڕووی قودســـی ســـیفاتا
دووری لـە عـەدەد لـە ئـەجـزا و تـەرکیـب
دووری لـــە تـــۆزی (کثـــره) و تـــەرتیـــب
واحیـدی (فی الخلق) موختـاری (فـیالکـل)
بـەبـێ ناچـاری و بـێعـەیـب و (عتـــل)[١٧]
قـەت ناگـەن (عقـول) بـە ئیـدراکی تـۆ
لـــە بـــاغی فامـــا وەرنـــاگرن بـــۆ
مەگەر بـە (فـەیـضی) ڕەحمـەتیـی قودسـی
بگــا بــە شــوعلەی حــوزووری نــەفــسی
بـــەنـــدە و دامـــاوی ئـــەرز و ئـــەفلاکـــین
عـــاجز لـــە پایـــەی فـــام و ئیـــدراکین
یـــــا مــــــن اخـــــتص بعـــــز البقـــــا
(نـــامی) بـــەش بـــدە لـــە بـــەهـــرەی لیقـــا

## الاحد

پـــەروەردگـــارا بـــە حـــەق تـــۆی ئـــەحـــەد
پـــاکی لـــە ئـــەجـــزا و پـــاکی لـــە عـــەدەد
نـــە یـــەک و نـــە دوو نـــە کـــەم نـــە زیـــاد
لـــەگـــەڵـــتا نییـــە بـــە شـــێوەی ڕەشـــاد
ئـــەو فـــەردیـــەتـــە وا لـــە ئـــەحـــەدا
نییـــە بـــۆ واحیـــد مـــەعلـــووم ئـــەبـــەدا

---

[١٧]. عتل: ناتەواوی

قـەسـەمـت ئـەدەم بـە ئـەحـەدیـەت
بـەبـێ نیازیـت بـە (صـمدیەت)
مـادام کـە (نـامی)ت هێنایـە وجـوود
بـا قـەت لانـەدا لـە خـەتی (حـدوود)

## الصمد

انـت المعبـود الفـرد الـصمد

قـەت وێنـەت نییـە نـە یـەک و نـە دوو
هـەر تـۆی مـەرجـەعـی لـەبـۆ مـەوجـوودات
هـەر بـۆ لای تـۆ دێ بـەنـدە بـۆ حاجـات
پـەروەردگـاری واحیـد و ئـەحـەد
دووری لـە والیـد دووری لـە وەلـەد
ئەتۆی پەناهی هەموو مەوجوودات
ئـەتـۆی بـێنیـاز لـە بـۆی کائینـات
نیـسبەتـت نییـە لـەگـەڵ حـەقـایق
الا أنـه انـک الخـالق
بابـە بـا بـردی بـێ موناسـەبـە
دایـە هـاودەردە بـۆ موحاسـەبـە
فـەرزە تـەنزیهـت لـەم پـەیـوەندانـە
نـەسـەب لـە خاسـەی حاجـەتمـەندانـە
لـە نـەقـسی عـەقـڵە و فـەسـادی ئـەوهـام
باسـی تـەنزیهـت لـە عـەلاقـەی عـام
واجبـە بـە حـەق نـەفـیـی عـەلاقـە
واحـب و مـومکین (ایـن الرفـاق)ە

بـــــه (لا الـــــــه الا الله) قـــــەســـــەم
بـــەم باســـە ئـــازار ئـــەگـــا بـــە جـــەســـەم
فـــەردی و ســـەمـــەدی و واحیـــد و ئـــەحـــەد
دووری لــــە تـــــۆز و غوبــــار و عـــــەدەد
لـــە بـــەر خـــاتری ئـــەســـحابی (افهـــام)
دوورم خــــەرەوە لــــە تـــۆزی ئـــەوهـــام
بــــەڵــــکوو بــــە ســــافی دەروونی ئاگــــا
پـــەنـــات بـــۆ بێـــنم ئـــەی خـــاوەن پـــەنـــا

## القادر المقتدر

قـــادری خـــاوەن ســـیفەتی تـــەئـــسیر
لـــە ســـەر ئـــیرادەی بـــەرزی بـــێ‌تـــەغـــییر
بـــــه خواســــتی ئــــەوە (بـــلا معتـــــرک)
ان شـــــــاء فعـــــل، ان شـــــــاء تـــــرک
مـــــــا شـــــــاء الله کـــــــان و مـــــــالم
یـــــشأ لــــم یکـــــن حــــەقــــە و (مــــسلم)
قـــــادر و موریـــــد لــــە ڕووی ڕۆزگـــــار
نـــە عیجـــزی هـــەیـــە نـــە بـــۆی (اضـــطرار)
کــــە هاتیتــــە کــــار تــــۆ موقتــــەدیــــری
یــەکــسانە لــە لات زوهــرە و موشـــتەری
مانیعـــــت نییـــــە (قطعـــــا) لــــە کــــارا
کــاری خــۆت ئــەکــەی بــەم بــارەوبــارا
ئــــەپاڕێنــــەوە بــــە دڵ بــــە زمــــان
بمانپـــارێزە لــــە ســــەلــــبی ئیمــــان

تــا (نــامی) لــەگــەڵ بــرادەرانــا
مــەحــشوور بــن لــەگــەڵ نــووری ئیمانــا

## المقدم و المؤخر

(شــؤون)ی فیعلیــت بــۆ تــەعمــیری کــەون
ناشــوبهێ بــە کــەس (اذ فــی البــین بــون)
خــۆت موقــەددیمــی ئــەوەی پێــشت خــست
دەرگــای ئاشــۆبت بــە ســەرا داخــست
خــۆت موئــەخخــیری ئــەوەی کــەوتــە پــاش
حیکمەت غــەیبییــە بــە کــەس نابــێ باش
شــێوەی عــەمــارەی عالــەمــی ئیمکــان
(فیهــا حکــم علــی مــا قــد کــان)
مــادام حیکمــەتی وابــوو کــەوا بــێ
نابــێ حــوکمی کــەس لێــرە ڕەوا بــێ
وای تــەعلــیم کــردین ســەرداری عالــەم
(ربنــا احکــم و هــو الاعلــم)
مــادام دروســتت کــردین بــە ڕەحمــەت
ئێمــەت نایــە ژێــر شاڕشــتەی ئوممــەت
بیکــە بــە نــووری ڕۆژی ڕوخــساری
ئــەوەی کــە نــاردت بــە ســەد نــازداری
(نــامی) ببــەخــشە لــە گــەردی (عیــصیان)
نــوورانی بکــە بــە نــووری ئیمــان
براکانیــشمان بــە میهــرەبــانی
ببــەخــشە چونکــە خــاوەن ئیحــسانی

## الأول و الآخر

خـــوا یـــەکـــەمـــی هـــەمـــوو مـــەوجـــوودی
(بالـــذات) بـــێعیللـــەت خـــاوەن وجـــوودی
بـــا قـــەت دەم نـــەبـــەیـــن لـــەبـــۆ عـــەیـــن و غـــەیـــر
انـــــــت البرهـــــــان لأصـــــــحاب الخیـــــــر
مـــــادام هـــــەر خـــــۆتی ئـــــەووەڵ و ئـــــاخر
(واجـــــب الوجـــــود) قـــــادر و قـــــاهیر
هانـــــام هێنـــــاوە بـــــۆ بـــــابی ســـــامی
(نـــامی) ببـــەخـــشە لـــە بـــای ناكـــامی
ئـــەی پـــەروەردگـــار ئـــەی خـــوای ڕەحـــیم
یـا (بـــر)ی (فیـــاض) بـــە فـــەیـزی عـــەمـــیم
تـــەنیـــا تـــۆ خـــوامی تـــەنیـــا تـــۆ (بـــر)ی
هـــەر تـــۆ ســـەرچـــاوەی ئیحـــسان و فـــەڕی
بمبـــەخـــشە بـــە (ســـر) (بـــر) و (تـــواب)یـــت
بمبەخشە بە (سر) ئیسمی (وهاب)یت
خۆت نـــاوی خـــۆت نـــا بـــە (بـــر) بـــە (رحـــیم)
خۆت بە خۆت فەرموو غـــەفـــوور و حـــەلـــیم
بمبەخشە بـــە (فـــیض) (وصـــف) و (اكـــرام)ی
چـــون عـــەبـــدی خـــۆتم عـــالم یـــا عـــامی
موسوڵـــــمانانیش بـــــە میهـــــرەبـــــانی
ببـــەخـــشە چونكـــە خـــاوەن ئیحـــسانی

## التواب

(تــواب) و (رحـــیم) خــودای میهــرەبــان
تۆبــەت دانــاوە بـــۆ خـــاوەن تـــاوان
ئــــەزانی (عیبــــــاد) خـــاوەن تـــاوانن
بــە کــەرەم عــەفــوت لــەبــۆ دانــاون
گــەر تۆبــەکــارن ئــەتــۆیش (تــواب)ی
ئــەگــەر بــەدکــارن (بــر) و (وهــاب)ی
بـــە موبالـــەغـــەی ئــەم وەســفە بــەرزە
ببــەخــشە جــورمی ئــەم بــەنــدە هــەرزە
تـــا (نـــامی) بـــژی بـــە کامـــەرانی
لـــەگـــەڵ پـــەیمـــانی دیــن و ئیمـــانی
خـــودای (منــــتقم) لـــە بـــەدئــەتـــواران
تۆڵــەی تــاوانسـێن لــە ســتەمکــاران
ئـــەوەی دوژمنـــە بـــۆ دیـــنی ئیـــسلام
ســەرنگــوون ببــێ لــە ســەر (انتقــام)
ئیـــسلام ئوســـوول و فـــورووعی بـــەرزە
پـیرۆزی ئــەدا بــۆ ئــەم ســەر ئــەرزە
ئـــەوەی ئـــەیـــەوێ کـــە بیفـــەوتێنـــێ
ئـــاگری (تۆڵـــە) بـــا بیـــسووتێنێ
ئاســـانە بـــۆ تـــۆ تۆڵـــە و (انتقـــام)
بــە مــەوت و فــەنــا و ئــەمــراز و ئــەسـقام
وا (منتقمــــــی) هـــــەم (مقتــــــدر)ی
ئیـــسلام ســـەرکـــەوێ بـــە (منتـــصری)

وەهـا ئێمـەت کـرد بـە سـوپای ئوممـەت
نـەسرەتمـان بـدە بـە لوتـف و ڕەحمـەت
لـە بـەر خـاتری چـرای ڕووی عالـەم
فـەخری (مرسـلین) ڕەسـوولی ئـەکرەم
پێمـانبـبـەخـشە نوورێـک لـەو چـرا
تـا دڵ ڕوونـاک بـین لـە هـەر دوو سـەرا
(نـامی) بنتـە ذیـز لای ئـەهلـی تـەفهـیم
نـورهم یـسعی بـین أیـدیهم
(سـراج)ی (منیـر) سـیفەتی ئـەوە
بـەشمـان پـێبـدە تـۆ لـەو پرتـەوە

## العفو

(یـاعفو) عـەفـوت قـەت دوایـی نایـە
هـەر بـەردەوامـە هـەتـا هـەتایـە
دەریـای عـەفـوی تـۆ شـەپـۆلی وایـە
شـامیلی هـەمـوو دەوری دونیایـە
(ماعـدا)ی (اشـراک) لـەو دەور و بـەردا[١٨]
قـەلـەمـی عـەفـوی دێـنی، بـە سـەردا
عـەفـوی گوناهـان هـەمـووی ئاسـانە
زاتـت مـەنبـەعـی عـەفـو و ئیحـسانە
سـیفاتی سـەلبیـت نیـسبەت بـە ئیجـاب
ئەو پێنج و ئەم حـەوت بـە یاسـای حیـساب

---

[١٨]. مەبەس لە دەوروبەر: تەوحیدە لە زات و سیفات و ئەفعالا.

بـــانی ڕەحمـــەتـــت گـــەلێـــک گوشـــادە
مایـــەی لـــە قـــارت گـــەلێـــک زیـــادە
بۆیـــــە میفتـــــاحی قورئـــــانی کـــــەریم
بـــوو بـــە (بـــسم الله الـــرحمن الـــرحیم)
تـــازەت کـــردەوە شـــەعـــاری ڕەحمـــەت
لـــە نـــاو قورئانـــا ســـوورەت بـــە ســـوورەت
ســـوورەی بـــەرائـــەت لـــەگـــەڵ کـــافر بـــوو
هـــەیبـــەتی غـــەزەب لـــەوێ وافـــیر بـــوو
(رحمتـــــی وســـــعت کـــــل شـــــیء) بـــەس
بۆ ڕەجای ڕەحمـەت لـە خـودای ئـەقـدەس
دەی ســا بــە ســیڕی ڕەحمــان و ڕەحــیم
(نـــامی) لا بـــدە لـــە نـــاری جـــەحـــیم

## الرؤوف

ئـــەی پـــەروەردگـــار ذەئـــووف و لـــەتیـــف
تلطـــــف بنـــــا فـــــی بـــــاب التكليـــــف
لا تكلفنـــــــا فـــــــی دور الآفـــــــاق
باســـــــتيلاء أصـــــــحاب النفـــــــاق
کـــە فـــەرمـــووت لـــەبـــۆ ذەســـوولی کـــەریـــم
بـــــــالمؤمنين رؤوف رحـــــــيم
مـــەعنـــای ئـــەمـــەیـــە دەرگـــای شـــەفاعـــەت
وازە بـــــۆ ڕەســـــوول ڕۆژی قیامـــــەت
ئـــەو کاتـــە ئوممـــەت دێنـــە ســـەر نـــەهـــات
بە جیلوەی هـەیبـەت لـە سـەر عـەرەسـات

ئـەو دێتـە حـوزوور سـوجدەت بـۆ ئـەبـا
بـۆ ڕزگـاری عـام تکـات لـێ‌ئـەکـا
تـا نیـدای بـۆ دێ (رأسـک ارفـع
سـل تعـط المنـی اشـفع تـشفع)
جـا بـە تکـای ئـەو بـۆ ئوممـەت هـەمـوو
ڕزگـاری بـۆ دێ عالـەم زووبـەزوو
لـەمعـەی شـەمعـی ئـەو (نورالانـوار)ە
یـەکـێ ئـەنـدازەی هـەزار ملیـارە
دەی بـۆ خـاتری شـای (نورالانـوار)
(نـامی) و برایـان ببـەخـشە لـە نـار
سـا بـە نـووری حـەق بـڕۆین بـە ڕێـدا
بـێ‌کـەس نـەکـەوین هـەرگیـز لـە جێـدا

## ذوالجلال و الاکرام

یـا ذالجـلال و یـا ذالاکـرام
انـت المـلاذ حـسبما یـرام
وەسـفی جـەلالیـت سـەلـبین (بالتمـام)
وەسـفی جـەمالیـت سـبووتین بـە عـام
بـە جیلـوەی نـووری بـاقی سـیفاتت
کـە پڕتـە بـەخـشن بـۆ دەرکـی زاتـت
سـیفەتی نـەفـسیت وجوودێکـە (خـاص)
کـە فـەهمـی ناکـەن بـە غـەیری (خـواص)

سیفاتی سەلبیت وەحدەت و قیدەم

بەقای ئەبەدی (بالوجه الاتم)

قیامی (بالذات) ئیستیغنا لە غەیر

بێموماسەلەی کائیناتی خەیر

سیفاتی زاتیت (سبع کاملات)

(احق سبعک) ڕەمزە بۆ سیفات[19]

سیفاتی سافی بەرزی مەعنوی

(اعتبارات)ی واقیعی قەوی

کونک حیاً الی الاخیر

(خیر المثال)ە لەبۆ تەقریری

سیفاتی سەلبی هەموو جەلالی

سیفاتی سبووت هەموو جەمالی

هەر دوو بەشەکان جەلالی و جەمال

تەعبیرن لەبۆ سیفەتی کەمال

خودایا بە حەق هەموو ئەوسافت

بە جاهی بەرزی هەموو ئەشرافت

(نامی) ببەخشە لەگەڵ یارانا

لەگەڵ ئەحباب و برادەرانا

تا بێنە حوزوور بە ئەمن و ئیمان

وەربگرن بەهرەی عیززەت و ئەمان

---

[19]. احق سبعک: پیتەکانی یەکەمی (صفة)ە زاتییەکانی خوای کۆ کردوەتەوە: أ: ارادە، ح: حیاە، ق: قدرت، س: سمع، ب: بصر، ع: علم، ک: کلام.

## مالک الملک

**(مالـــک الملـــک)** بـــۆ تـــۆ دێتـــە جـــێ
چـــون شـــتێ نییـــە لـــە حوکمـــت دەرچـــێ
لمـــــن الملـــــک الیـــــوم اســـــتفهام
بـــۆ (اعتـــراف)ی (خـــواص) و عـــەوام
ئـــەووەڵ و ئـــاخر (ملـــک) و (مالـــک)
خودایـــا هـــەر تـــۆی **(و البـــاقی هالـــک)**
چـــۆن ئـــەشـــێ مێـــشێ بـــڕوا بـــە نـــوورا
بـــڕوا بـــە کـــوورەی تـــەنـــووری ســـوورا
کـــێ هـــەیـــە یـــارای مـــالیکی ببـــێ
مـــادام نیـــشانەی هـــالیکی ببـــێ
مالیـــک بـــۆ مـــادە مـــەلیـــک بـــۆ مـــەعنـــا
هـــەر بـــۆ تـــۆ ئـــەشـــێ **(ربـــی ســـمعنا)**
کـــەس نـــەڵـــێ مـــەلیـــک یـــاخۆ مـــالیکم
بـــا بـــە دڵ بـــڵـێ بـــەنـــدە هـــالیکم
هـــەر کـــەســـێ وەهمـــێ بـــڕوا بـــە ســـەریـــا
بـــەرگـــی گـــەورەیـــی بکـــرێ بـــە بـــەریـــا
دێتـــە خـــوارەوە لـــە ســـەر تـــەختـــی عـــەرش
ئـــەبـــێ داکـــەوێ لـــە ســـەر فـــەرووەی فـــەرش
**قـــل اللهـــم مالـــک الملـــک**
ئـــەخوێنرێتـــەوە بـــۆ خـــۆش مـــەســـلەکـــی
ســـا خـــودا بـــە حـــەق مولـــکی زاتی خـــۆت
بـــەو ســـەڵـــتەنـــەتـــە کـــە (ثابـــت)ە بـــۆت

بمانپـــارێزە لـــە دەســـتی شـــەیتـــان
بـــۆ ســـەعاتـــێ دڵ ئـــەبـــێ بـــە قـــەیتـــان
تـــەوفیقمـــان بـــدە بـــۆ خزمـــەتی دیـــن
بـــە دڵ و بـــە دەم بـــە خامـــەی نووســـین
بـــەڵ ڕوومـــان ببـــێ ڕوومـــان دەرکـــەوێ
چاومـــان بـــە چـــاوی ڕەهبـــەرمـــان کـــەوێ
لـــە ســـایەی ئـــاڵای زاتی خـــۆش‌لیقـــا
بگـــەینـــە پایـــەی دیـــنی (ذی‌البقـــا)
(نـــامی) تالیبـــە بـــۆ زەوقـــی جـــامی
پێـــی کـــەرەم فـــەرمـــوو حوســـنی ئـــەنجـــامی

## الجامع

پـــەروەردگـــاری جـــامیع بـــۆ کـــەمـــاڵ
مـــانیع لـــە وەســـفی نوقـــسانی ئـــەحـــواڵ
اجمـــع شـــملنا فـــی ســـیر الاحـــوال
وامنـــع فـــصلنا عـــن خیـــر الاعمـــال
واجمعنـــا بمـــن یحـــب جمعـــک
وامنعنـــا عمـــن لا یـــری ســـمعک
واحـــشرنا تحـــت لـــواء الرســـول
ذلـــک معنـــی حـــصول الوصـــول

## الغنی المغنی

ئـــەی پـــەروەردگـــار (غـــەنی) لـــە عالـــەم
لە ئەهلـــی فـــەرش و لـــە عـــەرشـــی ئـــەعـــزەم

الیـــــک ربـــــی نحـــــن الفقـــــراء
وافقرنـــــا القـــــوم الکبـــــراء
وانـــت المغـــنی لمـــن قـــد تـــشاء
ئـەگـەر گـەدا بـێ ئـەیکـەی بـە پادشـا

تـۆی (مـوغنی) لـەبـۆ هـەر کـەس بتـەوێ
لـــە دونیـــا و دینـــا پایـــەی نانـــەوێ
ســیفەتــێ بــشێ لــەبــۆ (عیبــادەت)
نیعمــەتــێ بــشێ لــەبــۆ ســەعــادەت
پێمان کـەرەم کـە ئـەی خـودای (مـوغنی)
ئـەی خـاوەن عـەتـا بـۆ مـادە و مـەعـنی
لـە عیـززەتی نـەفـس لـە قـووەی قودسـی
لـە ئیـستیقامەت لـە بـەهـرەی شـەخسی

## الضار النافع

پـــەروەردگـــاری جـــامیع و مـــانیع
ئـەتـۆی زیانـدەر هـەر ئـەتـۆی نـافیع
هـەر تـۆی ئـەساسـی بـۆ زیـان و سـوود
هەر لـە لای تۆیـە گـەنجینـەی مـەقسوود
بـەبـێ خواسـتی تـۆ لـێم نـادا خـارێ
بـێمـەبـەسـتی تـۆ نـەکـراوە کـارێ
ســوود و زیانمـــان بـــە ئـــیرادەیـــە
ئـــەگـــەر ئیبـــادە یـــا ئیفـــادەیـــە

نـــەفـــع و زەرەرت دوور لـــە توهمـــەتـــە
هـەمـووی سـەراسـەر پـڕ لـە حیکمـەتـە
دەی بـــە لـــوتفی خـــۆت لام دە لـــە زەرەر
بـــە جـــاهی پایـــە و مایـــەی پێغـــەمبـــەر
نـــــەفعـــــم بـــــدەریٚ بـــــە وەزعێکـــــی وا
ســـــەربـــــەرزم بکـــــا کاتـــــیٚ ڕۆژئـــــاوا
(نـــامی) دامـــاوە و پـــەنـــای هێنـــاوە
هـــەناســـە ســـاردە و گـــەرمـــە هـــەنـــاوە
بـــــۆ برایـــــانی دیـــــنی ئیـــــسلامی
بـــە نـــەفعـــی شـــامیل بـــۆ خـــاس و عـــامی

## النور المبين

ئـــەی نـــووری هـــەمـــوو ئـــەرز و ئاسمـــان
بـــە نـــووری جیلـــوە و تـــەجـــەلـــلای ئیحـــسان
میـــــشکاتی نـــــووریش ڕووی کائیناتـــــە
عەرش و کورسی و عـەرز گـشت سـەماواتـە
ســـــوورەتی عالـــــەم ڕەهبـــــەری بـــــەرزە
ڕەحمـــەتی هـــەمـــوو سـەمـــا و ســـەر عـــەرزە
میـــسباحیش نـــووری ڕیـــسالەی عامـــە
زەیتـــیش تـــەوفیقـــی خـــودای عـــەللامـــە
بـــە فـــەیـــزی قودســـی وەهـــات داگیرســـان
پرتـــەو ببـــەخـــشیٚ بـــۆ هـــەر دوو جیهـــان
چرایـــــــەکـــــــی وا ناکوژێتـــــــەوە
تـــا بـــا لێـــیبـــدا بـــەرز ئـــەبێتـــەوە

هەرچەندە (نامی) دڵ چاو لە خەوە
بیکە بە (خادیم) بۆ ئەو پرتەوە
دونیا سەراسەر بە جۆش و تاوە
جێگەی سێبەریش وێنەی هەتاوە
بێجگە لە تاوی ئەم هەتاوانا
(نامی) سووتاوی تاوی تاوانە
بە ئیحسانی خۆت یا خودای ئەکبەر
چەتری ڕەحمەتی دانێ لە ڕاسەر
سێبەری شامیل بۆ سینە و سەرم
بەردەوامیش بێ هەتا مەحشەرم
برادەرانیش لەو ڕەحمە عامە
بەشدارمان بکە هەتا (قیامە)

## الهادی

ئەی هادی لەبۆ عاکیف و بادی
(انک انت الرؤوف الهادی)
بەندەم سەرگەردان لە دەشت و دەرا
ئەگریم من لە سەر دووری دڵبەرا
ئەگریم من لەبۆ چرایەک بۆ دڵ
وەکوو برابێ بۆ ماڵ و مەنزڵ
هاتیف پێم ئەڵێ بڵێ یا هادی
(انک انت رب العباد)
هیدایەت بۆ حەق سیفەتی تۆیە
وسوولی مەحسوول ئیحسانی تۆیە

هیدایـــەت بـــە ڕووی شـــارەزا کـــردن
ئـــەسـبابی زۆرە تـــا کـــاتی مـــردن
دایـــە و بابـــەیـــە و مامۆســـتای دەرزە
ئـــەمجـــارە هـــاوڕێی پانـــایی عـــەرزە
ئـــەمجـــار زورووفی چـــەرخـــی زەمانـــە
ئـــەمجـــارە مـــەکـــان باشـــیان بزانـــە
ئـــەمجـــا مورشـیدی دڵ خـــاوەن حـــوزوور
ئـــەوەی کـــە سینەی پـــڕ بـــووە لـــە نـــوور
دڵـــێک ئـــەڕوانـــێ بـــە بـــارەگـــادا
دەســـتی وا لـــە دەس (رســـول الله)دا
مـــەئمـــووری حـــەقـــە بـــۆ ئیرشـــادی عـــام
بـــۆ خزمـــەتکـــاری ئوممـــەتی ئیـــسلام
تـــا بـــە مولاقـــات یـــا فـــەیـــزی حـــوزوور
دەروونی (نـــامی) پـــڕ بکـــا لـــە نـــوور

## البدیع

یـــا بـــدیع الارض مـــع الـــسماوات
موبـــدیعی عـــەرش و کورســـی و کائینـــات
ئـــەتـــۆی ئـــیرادەت بـــە حـــەق هاتـــە ســـەر
خەلـقی کائینـات ئـەم سـەر تـا ئـەو سـەر
بۆیـــە کائینـــات (بالجملـــه) یـــەکـــسەر
تـــەســـبیحت ئـــەکـــەن (الله اکبـــر)
تـــا بـــۆ تـــەوحیـــدت بـــە دڵ بکۆڵـــێن
تـــا (لا الـــه الا الله) بـــڵێن

جــا دروســـتت کــرد گــەلی ڕەهبــەران
بــە فــەرد و عــەدەد لــە ڕۆزگـــاران
ســەرحــەلقــە ئــادەم (صــفی الله) بــوو
خاتـــەم (محمـــد رســـول الله) بـــوو
جیهانیــان پــڕ کــرد لــە نــووری ڕەحمــەت
هەر کەس بە قەد خۆی بە پایەی هیممـەت
ســا خــودا بــە حــەق عینایــەتی خــۆت
ســیرڕی ئیبـــداع و ڕیعایـــەتی خـــۆت
بــە حـــەقـــی نــووری دەروونی ئــادەم
بـە نـووری سـینەی ئـەحمـەدی خاتـەم
بــە نــووری دلــی ڕەهبــەران یــەکــسەر
بـە دۆســتانت لـەو سـەر تـا ئـەم سـەر
(نــامی) ببــەخـــشە لـــە تـــوونی تـــاوان
نـــووری پـــێبـــدە بـــۆ دڵ و چـــاوان
وەهــا بــە حیکمــەت دروســـتت کــردین
لـە کـەتمـی عـەدەم مـەحرووسـت کـردین
وەهــا لایقــە بــە فــەیــزی مــەننــان
بـەشـدارمان بکـە لـە ئـەمـن و ئیمـان
هــەتــا دەس بــە دەس نــەوەک دەربــەدەر
بگەینـە دەسـتی بـەیـزای پێغـەمبـەر (ص)
ئــەو پێغــەمبــەرەی ڕەهبــەری عامــە
حامیـــل و حـــامی نـــووری ئیـــسلامە
(نـــامی) وەرگـــری بـــە دەســـتی کـــەرەم
بـۆ لیقـای بـەقـای حـەزرەتی ئـەکـرەم

## الوارث الباقی

ئـــەی پـــەروەردگـــار واریـــسی بـــاقی
بـــۆ هـــەمـــوو عالـــەم (لاقـــی) یـــا (بـــاقی)
بـــەقایـــەکـــی وا لایقـــە بـــە تـــۆ
هـەر بـۆ تـۆ ئـەشـێ نـەک بـۆ غـەیـری تـۆ
بـــەقـــای عالـــەمـــی دۆزەخ و جـــەننـــەت
ئـەو لـەبـۆ زەحمـەت ئـەم لـەبـۆ ڕەحمـەت
هـــەمـــووی تـــابیعی بـــەقـــای خودایـــە
ئاســـــاری زاتی بـــــێئینتیهایـــــە
جـا ئـەهلـی کـوفران لـە فـەڕ مـەحـرووومن
ئـــەهلـــی ئیمـــانیش بـــەڕ و مـــەرحـــوومن
ئـــەو حیرمانـــەیـــە فـــەزەعـــی ئـــەکبـــەر
ئـــەم ئیمانـــەیـــە ڕەحمـــەتی ڕەهبـــەر
(نـــامی) ئـــەناڵـــێ (أمـــان الأمـــان)
بـــۆ دووریـــی کـــوفر و نزیکـــی ئیمـــان

## الرشید

ئـــەی پـــەروەردگـــار ڕەشـــیدی موتـــڵەق
بە عـیلم و حیکمـەت بـە عـەدالـە و حـەق
لـــە جیلـــوەی ڕوشـــدی خـــودای عالـــەمـــە
ڕوشـدی (جـن) و (انـس) زۆرە یـا کـەمـە
بـــە ڕێگـــەی ڕوشـــدا بـــە لوتـــف و کـــەرەم
بمانبـە بـۆ خـۆت ئـەی خـودای ئـەکـرەم

هـەرکـەس لـەو ڕوشـدە بـە دڵ بـەشـدارە
بـۆ هــەردوو عالــەم بــاش بــەختیــارە
ســاخوا (نــامی) عــەبــدی مــەجیــد بــێ
بـە ئیحـسانی خـۆت ڕۆحـی ڕەشـید بـێ

## الصبور

ئەی خودای خـالیق ئـەی خـودای سـەبـوور
ئـەی خـودای جـامیع بـۆ ئـەقسامی نـوور
جــامیعی خــەیـری هــەردوو عالــەمــی
جــامیعی بــەهــرەی بــەنیئــادەمــی
ســاحیبی سـەبـری بـە هـەمـوو ئـەحـوال
لـەگـەڵ ئـەهلـی دیـن یـا ئـەهلـی زەلال
ئـەو سـەبـرەی کـە تـۆ ئـەیکـەی لـە عالـەم
حیرەت دەرئەخـا بـۆ هـەمـووی سـەرجـەم
شمــەکــێ لـــەوە بـــۆ هـــەمـــوو ئافـــاق
ببـــێ دائـــەنـــرێ بـــە (ام الاخـــــلاق)
هـــەرچـــی ئـــەخلاقـــی بـــەرزی بـــەشـــەرە
مـــەنـــشەئـــی ســـەبـــری قـــەزا و قـــەدەرە
ســـەبـــر بـــەڕاســـتی (ام الاخـــــلاق)ە
هـــەتـــاوی بـــەرزی هـــەمـــوو ئافاقـــە
هـــەرچـــی ئـــەنـــوارە بـــۆ دڵـــی ئاگـــاه
لـــە ســـەبـــرەوە دێ (بـــلا اشـــتباە)

سـەبـوور بـەڕاسـتی زاتی خودایـە
هـەر سـەبـری خـودا سـەبـرە بـە مایـە
سـەبـر لائیقـە لـەبـۆ زاتی ئـەو
وا لـەگـەڵ عـیلم و ئیـدراکاتی ئـەو
لـەگـەڵ ئـەو هـەمـوو نیعمـەتـە ئـەیـدا
لـە لای عالـەمـدا ئـەبـێ هـوەیـدا
هێـزی وجـوود و فـەرەح و سـروور
دیمـەن و ئـەخـلاق عـیلم و حـیلم و نـوور
ئەیاندەی بە خـەڵـک بـە مـەحـزی ئیحـسان
هـەتـا ناقیـسێ ببـێ بـە ئینـسان
کـەچـی لـە بـاتی سوپاسـی خـودا
ئینکـاری نیعمـەت دێنـێ بـە ڕوودا
ئینکـاری زات و تـەجـەلـلای زاتی
ئینکـاری فـەزلی ڕووی کائینـاتی
ئـەگـەر سـەبـری حـەق نـەبێ لـە کـارا
عالـەم نایـەڵـێ لـە ڕۆزگـارا
(واقعـاً) ئـەتـۆ بـە حـەق سـەبـووری
سـەراسـەر حـیلم و حیلمـی مـەسـتووری
یـا دائـەپۆشـی تـاوانی بـەدکـار
تـا لـە دونیـادا نـەڕوا شـەرمـەسـار
یـا عـەفـوی ئـەکـەی بـە فـەیـزی ئیحـسان
یـا مۆڵـەت ئـەدەی بـە ئـەهلـی تـاوان
جـا ئایـا ئـەمـە بـۆ غـەیـری خـودا
چلـۆن قابیلـە و چلـۆن دەس ئـەدا

بـەڵـێ وا ئـەبـێ بـەعـزێ سـتەمکـار
کـە هـاتوو گـرتی لـە سـەر قـین و قـار
بـە داوی غـەزەب وەهـا ئـەیگـرێ
بـەرەڵـلای ناکـا هـەتـاکوو ئـەمـرێ
ئـەڵـێی نامیـسە[٢٠] لـە ملـی مـارا
نـەفـەسـی ئـەگـرێ لـە ڕۆزگـارا
ئـەمـەیـە مـەعنـای (مـا لـە أنـصار)
لـەبـۆ ئینـسانی هـاری سـتەمکـار
بـە بـەراوردم لـە ڕۆزگـارا
نـەمـدی ڕزگـاری لـە سـتەمکـارا
بـەعزێکیـان ئـەگـرێ بـە چـەرمـەسـەرێ
قـەت بـەری نـادا هـەتـاکوو ئـەمـرێ
بـەعـزێ کـوتوپـڕ ئـەدا لـە ملـی
ئـەدا بـە عـەرزا قـەوارەی زلی
بـەڵام بـە وادە کـە وادەکـەی هـات
مۆڵـەتی نـادا بـە ڕۆژ یـا بـە سـات
جـا خـودا بـە حـەق سـەبـووری زاتـت
بـە حـەقـی جیلـوەی حیلمـی سـیفاتت
لـە سـەبـر و سـیدقی بـە ئیـستیقامەت
کـەرەم کـە لـە بـەر ئـەجـری قیامـەت

[٢٠]. نامیس: کرمێکە لە وڵاتی میسرا هەیە، دوژمنی مارە کە خۆی ئەپێچێ بە ملی مارا بەرەڵای ناکا تا ئەیخنکێنێ.

## الصادق

ئـەی خـودای (صـادق) بـە هـەمـوو مانـا
ئـەمـەیـش مـەعلوومـە لای عـەقـڵی زانـا
هـەتـا نـووری حـەق لـە سـەر دڵ هـەڵـێ
(مـن اصـدق مـن الله) بـلـێ
صـدقت حقـا مـع النبیـین
فنـصرتهم فـی الـدنیا والـدین
صـدقت مـع القـوم المـؤمنین
صـدقت مـع القـوم الكـافرین
ئـەوان ئـەنێـری بـۆ دۆزەخـی زشـت
ئـەمـان ئـەسـپێری بـە بـاغی بـەهـەشـت
بـێفـەرقـە لـە لات لاتـێ یـا شـایێ
ئینـسانی دارا لـەگـەڵ گـەدایـێ
سـا خـودا بـە حـەق سـەبـر و سـەدەقـەت
بە قەد وەفای خۆت لە سەر وەعدەكەت
(نـامی) ببـەخـشە لـە نـەخـشی تـاوان
تـا ڕسـوا نـەبـێ لـە كـۆڕی پیـاوان
هـەروا ڕەحمـەتی عامـت بنێـرە
بـۆ بـرادەران لـەوێ یـا لێـرە
ئـەی پـەروەردگـار سـەتتـاری عویـووب
حـافیزی ئـەسـرار غـەففـاری زونـووب
داوا ئەكەم لێـت لـە سـەر پـەردەی غـەیـب
عـەفـوی تـاوان و داپۆشـینی عـەیـب

وەکـــوو تـــا ئێـــستا عـــەیبـــت پۆشـــیوین
وا تاوانیـــشت بـــە حـــەق بـــەخـــشیوین
ئومیـــــدم وایـــــە تـــــا وام لـــــە دونیـــــا
ئیحـــسانت بۆمـــان بکـــەی بـــە دەریـــا
تـــا ئـــەو ســـەعاتـــە ئـــەگـــەینـــە ئاکـــام
ئاخرمـــان بـــینی بـــە حوســـنی خیتـــام
ئـــەمجـــا سوپاســـم بـــۆ خـــودای بینـــا
بە قەد ئەسراری گـشت ئـەسمـای حوسـنا
هێـــوام وەهایـــــە وا ئیحـــسام کـــردن
ببنـــە شـــاهیدم لـــە کـــاتی مـــردن
هـــەزاران ســـوپاس بـــۆ زاتی خـــودا
لـــە ســـەر مونتـــەهـــا و لـــە ســـەر موبتـــەدا
هـــەزار دروودم بـــۆ زاتی ڕەهبـــەر
فورســـتادەی حـــەق بـــۆ پـــەری و بـــەشـــەر
بـــۆ ڕەهبـــەرانی عالـــەم ســـەراســـەر
بـــۆ ئـــال و بـــەیـــت و یـــارانی ئـــەنـــوەر
جـــا عـــەرزت ئـــەکـــەم ئـــەی خـــودای بینـــا
دەســـبەردار نـــابم بـــە ئـــەسمـــای حوســـنا
(توســـل) ئـــەکـــەم بـــە ئـــەسمـــای ڕەســـوول
دەلیلـــی ڕەحمـــەت، وەســـیلەی وســـوول
چـــون ئـــەو ناوانـــە یـــەک یـــەک نـــاوێکن
بـــۆ مـــەوجـــی ئـــەنـــوار خـــاوەن تـــاوێکن

## محمد

جـا تكـا ئـەكـەم بـە سـەعـدی سـەرمـەد
مایــەی پــیرۆزیم نــاوی موحــەمــەد (ص)
ئـەو نـاوەی نـەقـشی هـەیـە لـە عـەرشـا
پرتـەو ئـەبـەخـشیَ بـە سـاحەی فـەرشـا
ئــەو نــاوەی لــەگــەڵ نــاوی خــودادا
ڕوكــــنی تاعـــەتـــە لـــە لای عیبـــادا
ئــەو نــاوە ڕوكنــە بــۆ دیــنی ئیــسلام
شــەهــادەتــەیــنی پــیَ ئــەبــیَ تــەمــام
ئــەو نــاوەی كــەوا خــودای بــیَنیــاز
ناردیــە ســەر عــەرز بــە قــەدر و ئیعــزاز
ئــەو نــاوە نــووری ســەمــا و زەمینــە
لـــەبـــۆ (رحمـــــە للعـــــالمین)ە
ئـەو نـاوەی كـە بـوو لـە نـاو تـەوراتـا
بـــــلاو كـــــراوە لــــــە كائیناتـــــا
ئـەو نـاوە كـە هـات لـەگـەڵ ئینجـیلا
بـۆ مـژدەی عیـسا لـەگـەڵ تـەنـزیلا
كـە ئیلـهامی كـرد خـالیقی سـەمـەد
بـۆ جـەددی ئـەمجـەد یانـیَ (محمـد) (ص)

## احمد

جـا نـاوی ئـەحمـەد بـەشـارەی عیـسا
تـاج بـوو لـە سـەری بـەرزیـی ڕەئیـسا

## محمود

ئـــەمجـــارە مـــەحمـــوود نـــاوی ئاسمـــان
لـــە لای فریـــشتەی پـــاکی بـــێگومـــان
ئـــەو نـــاوەی کـــەوا لـــە ســـەماواتـــا
نـــوور پـــەخـــشانی کـــرد بـــە کائیناتـــا
ئـــەو نـــاوە خـــودا ئیختیـــاری کـــرد
بـــۆ ستایـــشی ئیعتیبـــاری کـــرد
ئـــەو نـــاوەی کـــە بـــوو بـــە دەوای ئـــەلـــەم
بـــوو بـــە هـــەتـــاوی دەروونی عالـــەم
ئـــەو نـــاوە ئـــەکـــەم بـــە نـــاو و نیـــشان
بـــۆ وەسیلەی خـــەیـــر ڕەهبـــەری ذیشـــأن
بـــەو نـــاوە تکـــا ئـــەکـــەم خودایـــا
بـــانگی پـــێئـــەدرێ لـــە ڕووی دونیـــادا
(نـــامی) بـــۆ دەرگـــات پـــەنـــای هێنـــاوە
بـــە تکاکـــاری ئـــەو خـــاوەن نـــاوە
بـــە ســـەفـــای سینەی بـــێتـــۆز و کـــەدەر
بـــە وەفـــای دیـــنی ڕەهبـــەری ئـــەنـــوەر
اشـــرح لـــی صـــدری وارفـــع لـــی قـــدری
ویـــسر امـــری و نـــوّر قبـــری
بـــەو نـــاوە ڕوکنـــە لـــە نـــوێژی عـــەبـــدا
تـــەرکـــی موبتیلـــە لـــە کـــاتی عـــەمـــدا
پـڕ لـــە ســـەنـــا بـــوو بـــە ســـیغەی کـــەســـرەت
چ کـــاتی غـــەیبـــەت، چ کـــاتی حـــەزرەت

یــــانی (محمـــــــد) ڕەهبــــەری عالــــەم
تــــاجی شــــەرەفی حــــەزرەتی ئــــادەم
کــە کــردی بــە هــۆی ڕزگــاریی بــەشــەر
ئــەوەی بــەشــی بــوو دەرچــێ لــە خــەتــەر

## وحید

خـــودا بـــە پایـــەی ڕەســـوولی وەحیـــد
مایــەی تــەرویجــی کــەلیمــەی تــەوحیــد
یانـــێ لـــەقـــەبـــت دانـــا بـــە وەحیـــد
چونکی وەحیـد بـوو بـۆ نـەشـری تـەوحیـد
یــەقــین ئــەو زاتــە فــەردی جیهــان بــوو
مــەحــرەمــی ســیڕڕی زاتی یــەزدان بــوو
دەردی دەروونم بـــــــاتین و زاهـــــــیر
شــیفای پــێبــدە بــە لــوتفی بــاهیر
دامنـــێ لـــە ســـایەی نـــووری موحـــەمـــەد
تـــا پڕتـــەو لـــێمدا تـــا کـــاتی ئـــەبـــەد

## سید المرسلین

ئـــەوەی ســـەیـــدە لـــەبـــۆ مورســـەلـــین
ئـــەوەی خاتـــەمـــە لـــەبـــۆ (نبـــێین)
ئـــەوەی ســـەیـــدی بـــەنیئـــادەمـــە
مـــەعلـــوومی ئـــەهلـــی عیلمـــی عالـــەمـــە

## خاتم النبيين

ئایـــــەی (ولکـــــــن رســـــــول الله)
هــەتـا هــەتایــە بــەســە بــۆ جــاهی

## رحمه للعالمين

ئـــــەوه (رحمــــــه للعـــــالمين)ه
ئـــەوه ئیمـــامی گـــشت موتتـــەقینـــە

## قائد الغر المحجلين

قائیـــــدی (غـــــری) (محجلـــــین)ه
ســـەییـــدی ئـــەهلـــی شـــەرەف و دینـــە
یـــانی دەســـگری گـــەلی مـــوئمینین
دەســت و پــێ و ڕوخــسار سـپی و نـازەنـین
جــوانی ئــەعزایـــان لـــە بـــەر دەسـنوێژ
شــەخـسی بــێدەســنوێژ گــلۆڵەی گێــژە
یـــانی دەســـگری ئـــەهلـــی تاعـــەتـــە
ئــەوەی ســـالیکی ڕێـــی شـــەفاعـــەتـــە

## كاشف الكرب للمكروبين

(کاشـــــــف الکــــــرب للمکـــــــروبين)ه
چونکـــــــه (شـــــفیع للمـــــــذنبين)ه

## غياث المستغيثين

ئـــــــەوه (غیـــــاث المـــــــستغیثین)ه
ئـــەوه ســـادیقه ئـــەوه ئـــەمینـــە

## الطيب الطاهر

(طيــب) و (طــاهر) بــــه نــــاو و بــــه زات
ئــەوە ســەرچــاوەی فــەیــزی بــەرەكــات

## النبي الامي

گــەلــێ عــەجیبــە كــە نــەبی ئــوممی
بــوو بــە ســەرچــاوەی فنــوونی عیلمــی
لــەگــەڵ ئــەوەدا نــەخوێنــدەوار بــوو
ئوســـتادی دەرزی گــەلی هوشـــیار بــوو

## القرشي الهاشمي

نــەبی قــورەیــشی هــاشمی نــەســەب
خولاســەی عالــەم عــەجــەم و عــەرەب

## المكتفي و الكافي

ئــەوە موكتــەفی بــە فــەیــزی خــودا
كــافی بــۆ فــەیــزی ئــەنــواری هــودا

## الماحي

ئــەوە (مــاحی)یــە بــۆ حالــی تــاوان
بــۆ یــەكــی بــە دڵ بێتــەوە نــاوان

## القيم

ئــەو بــوو (قــیم) بــوو بــۆ دیــنی خــودا
بــۆ تــەبلیغــاتی ئایــاتی هــودا

## المحیی

ئەو بوو (محیی) بوو بۆ دڵی مردوو
بە مەرجی ئیمان بەبێ یەک و دوو

## شفیع المذنبین

ئەوە (شفیع للمذنبین)ە
بڕۆ بوخاری بە دڵ ببینە
چاو هەتا خێڵ بێ دڵ خاوەن حاڵە
هەر دڵە خاوەن عەقڵ و کەماڵە
لە سەر ڕەحمی تۆ ئەکەم ئیعتیماد
بۆ تکاکاری سەرچاوەی ئیرشاد
حەیای تکاوە شەخسی بێحەیا
مونکیری تکای شاهی ئەنبیا
لەبۆ (ابراهیم) کە نار بوو بە نوور
مووسا ڕاوەستا لە سەر کێوی توور
عیسا ئیحیای کرد جەسەدی مردوو
بۆ پایەی ئەحمەد مەکە یەک و دوو
خودا تەجەللای خستە سەر بەندە
چ (ابن عمران) چ خدری زیندە
عەبدی خۆی ئەکا بە غەیسی ڕەحمەت
ئەیکا بە (غیاث) بۆ هەموو ئوممەت
کە قەترەی باران غەیسی (مغیث) بێ
شای ڕۆژگاران ئەبێ ڕەئیس بێ

ســــــیڕی قــــــودرەتی زاتی (لــــم یــــزل)
ڕووی کــردە هــەر کــەس جــەلیــل و (اجــل)
ئــەیکــا بــە (مظهــر) لــەبــۆ کــەرامــات
(خــــــذ ولا تغفــــــل هیهــــــات هیهــــــات)
زاتێکـــــی وەهـــا بـــە ئـــەمـــری خـــودا
عالــەمــی هــەســتان لــە گــەرمــە خــەودا
بیــــدار بوونــــەوە بــــە (جهــــد) و (جهــــاد)
بــۆ (علــم) و (تعلــیم) بــۆ (وعــظ) و (ارشــاد)
هیــوام بــەهێــزە کــە ڕۆژی مــەحــشەر
بمانخاتــە ڕیــز خولاســەی بــەشــەر

## الطاهر المطهر

زاتی تــاهیر بــوو بــە حــەق (مطهــر)
بــۆ قــەلــبی ئوممــەت (بــاطن) و (ظــاهر)

## الناصح

ئــەو پێغــەمبــەرەی بــە حــەق ناســیح بــوو
بــۆ دەرگــای ئیرشــاد بــە حــەق فــاتیح بــوو

## النصیح

نــەســیح و مــوخلیس بــۆ دیــنی ئیــسلام
بــە ڕەوشــتی بــەرز بــە یاســای ئیکــرام
وای نــەســیحت کــرد ســەیــدی عالــەم
بــۆ جــین و ئیــنس و عــالیم و ئــەعلــەم

کـــێ (متمــسک) بـــێ بـــە (عــروە)ی (تقـــی)
(متمـــــسک)ە بـــــە (عـــروە)ی (وثقــــی)
دەســـتەوێنێکـــە دەســـتی پـــێبگـــرێ
لـــە ســـەر پـیرۆزی و ســەعـادەت ئـەمـرێ
لـــە کـــاتی حـــشرا ســـەر ئێنێتـــە دەر
بـە خۆشـی ئـەڕوا بـۆ دەشـتی مـەحـشەر
بـــەبـــێ زەحمـــەت و خـــەم و دەردیـــسەر
ئـــەگاتـــە ســـایەی لیـــوای پێغـــەمبـــەر
یـــانی ســـێبەری ســـەربـــەرزی ئـــەمجـــەد
ئـالای بولـــەنـد و بـالای موحـــەمـــەد (ص)
ئـــاخ لـــەو لیـــوادا بـــە شـــەوق و شـــادی
بـــاش ئـــەمخوێنـــدەوە نـــەوای ئـــازادی
(نـــامی) دەمێکــــــە ئومێـــــدی وایـــــە
لـــەویـــا بانـــگ بکـــا لـــەو خـــاوەن پایـــە
ئـــەی ڕەهبـــەرەکـــەی عـــالیم و عـــامی
لا بکـــــەرەوە بـــــەرەو ڕووی (نـــامی)
خدمـــەتکارێکـــە بـــە زەوق و عوشـــرەت
لـــە بـەر عـەتـەبـەی دەروازەی حـــەزرەت
بـەڵـکوو سـروەیـەک لـە بـای فـەیـرۆزی
بـــۆ مـــن ببێتـــە مایـــەی پـــیرۆزی

## النور ... السراج

ئـــەی (نـــور)ی (مبـــین) (ســـراج)ی (وهـــاج)
ئـــەی چـــرای شـــەوی (اسـراء) و (معـراج)

لە (مکە) تا قودس بە سەر بوراقا
تا دەرچووی بە سەر (سبع الطباق)ـا
ئەمجا ڕەفرەف بۆ مەسعەدی عورووج
(لما لم یمکن فوقە الخروج)
موناجاتت کرد بە نەجوای شەخسی
لە بەر بارەگای بێهەمتای قودسی
تا گەڕایتەوە لەگەڵ دەرەجات
بە پێنج فەرزەوە بە چەن موناجات
زاتێ کە نووری چرای عالەم بێ
تاجی شەرەفی بەنیئادەم بێ
(سراجی)ی (منیر) عالەمئارا بێ
ڕۆحی کارەبای ناو بارەگا بێ
ناکوژێتەوە هەتا هەتایە
نووری (محمد) چرای دونیایە

## الهدی

چرای (هدایە) و نووری لامیعە
بۆ خەیری دین و دونیا جامیعە
چرای عینایەی جامیعە لەبۆ
هودای ڕەهبەران لە کۆنە و لە نۆ
(فبهداهم اقتدە) بگرە
لە سەر ئەو ڕێگا بە ڕەحمەت بمرە
چرایەک خودا هەڵیگیرسێنێ
بۆ هەر دوو عالەم (ضیا) ئەنوێنێ

ناکوژێتــــەوە بـــە عـــەونی خـــودا
ئـەسـووتێ هـەرکـەس دەسـتی لـێبـدا

## الفاتح

تــەعریــف نــاکرێ بــە شــەرحــی زمــان
فاتیح بـوو بـۆ خـەیـر بـۆ ئـەمـن و ئـەمـان
فـــاتیحی دەرگـــای دڵـــی موسولـــمان
بـــۆ وەرگـــرتنی ئـــەخـــلاق و ئیمـــان
فـــاتیحی دەرگـــای پـــیرۆزی بـــۆ گـــەل
بـۆ مایـەی ئیمـان بـۆ عـیلم و عـەمـەل
فـــاتیحی خـــەیبـــەر مـــاوای پڕلـــەکـــە
فـــاتیحی شـــاری پـــیرۆزی مـــەککـــە
شـەسـت و سـێ حـەربی هـەبـوو (مظفــر)
لـە بیـست و شـەشـدا حـازر بـوو ئـەنـوەر
هـەمـووی بـۆ ئـیعلای کـەلیمـەی تـەوحیـد
بـۆ نـەشـری دیـن بـۆ قـەریـب و بـەعیـد
فـــاتیحی دەرگـــای بـــەرزی شـــەریعـــەت
فـــاتیحی دەرگـــای گـــەورەی شـــەفاعـــەت
فـــاتیحی دەرگـــای بـــەهـــەشـــتی بـــەریـــن
لـــەبـــۆ ئـــەهلـــی دیـــن یـــار و تـــابیعین

## الجبار

(جبـــار)ی کـــەســـری دڵ و دەروون بـــوو
مـەرهـەمـی زامـی جـەهـل و جنـوون بـوو

هیـــــوام وەهایـــــە وەکـــــوو شـــــامەردان
ببــێ بــە تــەبیــب بــۆ دەردمــەنــدان

## الجامع

(جـامع) بـــوو لـــەبـــۆ هـــەمـــوو (فـضائل)
(مـانع) بـــوو لـــەبـــۆ ڕێگـــەی (رذائـل)
جـــامیعی خـــەیـــری دونیـــا و ئـــاخیرەت
بـۆ ئـەهلـی عـەقـڵ و دەرک و بـەسـیرەت

## علم‌الایمان

(علـــم‌الایمـــان) نیـــــشانەی دیـــن بـــوو
باعیسی حـەیا و عـەقـڵ و تـەمکـین بـوو
کـــەســێک ســـەعاتـێ بمایـــە لای ئـــەو
ئـــەبـــوو بـــە تـــاوی پـــڕ نـــوور و پڕتـــەو

## العفو

(عفـو) بـــۆ خـــاوەن عـــەفـــوو ســـەماحـــە
لـــە تاونبـــاری پـــڕ لـــە قـــەباحـــەت

## الحق

حـەق بـوو لـە ئیـسم و ڕەسـم و حـودوودا
چ لـــە غـــەیبـــەتـــا چ لـــە شـــوهوودا
ڕەهبـەری حـەق بـوو بـە ڕووی حـەقیقـەت
بـۆی دامـەزرانـدین ڕێگـەی شـەریعـەت

## مطهر الجنان

(ظــاهر) و (بــاطن) پـــاک و خـــاوێن بـــوو
دڵــپاک و دەمپــاک بــەری داوێــن بــوو
**(واقعــــــــــــــــاً)** (مطهرالجنــــــــــان)ە
ئـــەوەی ســـاحیبی ڕەوزەی جینانـــە

## ابوالقاسم، ابوالطیب، ابوالطاهر

(ابوالطیـــــب) و (طـــاهر) و **(قاســــــم)**
خـــاوەن دوو لێـــوی باریـــک و باســـم
**(عبـــدالله)** و **(قاســـم)** لـەگـەڵ ئیـبراهیم
سـێ کـوڕ بـوون لـەبـۆ سـەروەری عـەزیم
**(طیـــب)** و **(طــاهر)** لـەقـەب بـوو لـەبـۆ
**(عبـــــدالله)** و قاســـم گـــەورەزادەی نـــۆ

## رسول الملاحم

ئــــەبــێ **(رســـــول الملاحــــم)** وابــێ
بــۆ جــەنگــی دوژمــن زۆر موهــەییـا بــێ
ڕەســـوولی ســـوپای بـــەرزی مـــەلاحـــیم
لـــە عـــەیـــنی کاتـــا **(ڕۆوف)** و **(راحـــم)**

## عزیز

**(عزیـــــز القــــدر)** عـــالی دەرەجـــات
خـاوەن سـەماحـەت بـۆ ئـەهلـی زەلـلات

## عبدالله

(عبدالله)ی بە حەق ئەبێ ئاوا بێ
بە بەرزی و نزمی عەبدی خودا بێ
تا مەولای عالەم جیلوە بدا بۆی
گفتوگۆ بکا لەگەڵ عەبدی خۆی
بە دڵ بە دەماخ لە هەموو لاوە
وەربگرێ کەلام لە لای خوداوە
بەبێ حەرف و سەوت بە شێوەی لایق
وەربگرێ لە حەق عەینی حەقایق
عبدالله بە حەق ئەبێ بە ئیمان
لایق بێ لەبۆ تەنزیلی قورئان
نزل الفرقان علی عبده
کی ینزل بالحق علی حده
عبدالله ئەبێ بۆ بانگی پەری
(ثابت) بێ لە سەر ڕێی پێغەمبەری
انە لما قام عبدالله
ئوستادە لەبۆ شاگردی ئاگاه
عبداللەی بە حەق لە ئەسنای نوێژا
خوا ڕەحمەتی خۆی بە سەردا ڕێژا
با بمرێ بۆ خۆ (الذی ینهی)
بشۆرێتەوە لە قەدر و بەها
ئەم عوبوودیە مەقامی وابوو
(خاصە)ی حەزرەتی (رسول الله) بوو

## علم الهدى

(علم الهدى) نیشانەی هودا
مەهدی بوو خودا هیدایەتی دا
مەهدی بوو بە حەق لە لای خوداوە
خەلاتی بۆ هات لە بارەگاوە

## المهیمن

(مهیمن) واتە خاوەن (ئیدارە)
(مستوی) لە سەر ڕشتەی کردارە
(مهیمن) لە سەر کار و باری دین
خاوەن هەیبەت و ویقار و تەمکین
(مهیمن) لە سەر تەبلیغی ئەحکام
بۆ ئەسل و فەرع و ئادابی ئیسلام
(مهیمن) لە سەر خولقی عائیلە
هەتاکوو نەبن بە هۆی غائیلە
(مهیمن) لە سەر ئەحوالی نەفسی
(مهیمن) لە سەر کەمالی قودسی
لا یسعنی فیه من ملک
مەعنای وا لە سەر ما فەوقی فەلەک

## المصطفى

(مصطفى) لە خەلق لە هەموو عالەم
لە فریشتەی پاک لە پەری و ئادەم

هـــەتـــا گـــەیـــشتە شـــابازی (قـــدم)
یـــــــانی (محمــــــــد) ... والله أعلــــــم

## المجتبى

هـــەروا (مجتبـــى) ئـــەویـــش (مختـــار)ە
(مختـــار)ی عیلمـــــی خـــــودای (غفـــار)ە
(غـــوث) و (غیـــاث) و (احیـــد) و (وحیـــد)
سـیفاتی خـودان بـێشـوبهە و تـەردیـد
بـە وێنـەی کـەریم کـەرەم بـە ڕاسـی
ئـەبـێ بـۆ زاتی خـودا بناسـی
بـەلام کـە خـودا کـەرەمـی فـەرمـوو
ئـەبـێ بـە وەسـفی (محسنین) هـەمـوو
(غیثـا مغیثـا) لـە نـوێژی بـاران
واتـەی حـەزرەتـە لـە لای هوشـیاران
کـە (غیـث)ی (مغیـث) قـەتـرەی بـاران بـێ
(بـالأولى) لـەبـۆ شـاهی یـاران بـێ
نـەسـیحەت جـارێ بـۆ عـاقڵ ئـەکـرێ
نابـێ بـە ناحـەق بـەهانـە بگـرێ
خـودا خـەللاقـە بـۆ هـەمـوو عالـەم
لـە سـەر و لـە خـوار لـە زۆر و لـە کـەم
(فعـل)ی (مکـسوب)ە بـۆ بـەنـدەی خـودا
دروسـتە داوای بـێشـەڕ و غـەوغـا
(اذ تحيـى المـوتى) بـو کـوڕی مـەریـەم
بـە ئیـزنی خـودا ڕاسـتە و موسـەللەم

ڕەهبــەر لــەم بابــە فــەردی (وحیـد)ە
هــەرچــەن ئیمکــانی (هـل مـن مزیـد)ە
ئــەی (نجـم)ی (ثاقـب) .. (المـدد) مــەدەد
لـــە ســـەر ئیجـــازە (الله احـــد)

## النجم الثاقب

نــەجمــی (ثاقـب) بــوو لــەبـۆ ســەمــاوات
عالــەمــی دەرکــرد لــە ڕێــی (ظلمــات)
نــەجمــی (ثاقـب) بــوو (شـهاب)ی (مبـین)
لــەبــۆ (رجـوم)ی گــرۆی شــەیــاتین
نــەجمــی (ثاقـب) بــوو لــەبـۆ سـینە و دڵ
گــەلــێ کــاروانی گــەیانـدە مــەنـزڵ
نــەجمــی (ثاقـب) بــوو لــەبـۆ موشـکیلات
زۆر کەوتووی نــەهـات بـەو گـەیشتە هـات
ئــەی نــەجمــی ســاقیب دڵــم تاریکــە
ڕێگــای شــەویــشم گــەلــێ باریکــە
بــە ئیــزنی خــودا مــن لــە تــۆم ئــەوێ
لــەو نــەجمــە بـۆم بــێ شــەوقــێ پرتــەوێ
کاتــێ ئــەو نــەجمــە کــەوتــە ڕووی دونیـا
عــەهــدی فــەتــرەت بــوو بــەبــێ ئــەنبیـا
یانی ئەو چــەرخــە چــەرخــی فــەتــرەت بــوو
نــە بــەیــانی دیــن نــە شــەریعــەت بــوو

علـــــــی فتـــــره مـــــــن الرســـــــل

ئـــەعـــلا دەلیلـــە دەلیلـــی جـــەلی
(فهـــم غـــافلون) لــــه (صـــدر)ی یاســـین
بخوێنـــەرەوە بـــە یاســـای تـــەحـــسین
لـــە چـــەنـــد ئایـــەتـــا ئـــەم باســـە هـــەیـــە
ئـــەم باســـە ڕاســـتە و حـــەقناســـی هـــەیـــە
کـــێ (مخـــالف) بـــێ ئالـــەم کـــەلامـــا
بـــــۆ وەلامـــــی ئـــــەو (قـــالوا ســـــلاما)

## القوی

ئـــەی (قـــوی) لـــە ســـەر ئـــەرکـــی ڕیـــسالەت
خـــاوەن هیممـــەت و خـــاوەن جـــەلالـــەت
خـــاوەن هێـــز لـــە ســـەر ســـیهامی کوففـــار
بـــە شـــێوەی تانـــە و تـــەشـــەر و ئـــازار
ئـــەی قـــەوی بـــە دڵ ئـــەی قـــەوی بـــە حـــاڵ
ئـــەی لایـــق بـــە حـــەق بـــۆ پایـــەی کـــەمـــاڵ
خـــــاوەن هیممـــــەت و عـــــەزم و توانـــــا
بـــە حـــەواس بـــە دڵ بـــۆ فیکـــری زانـــا
ســـەرچـــاوەی عـــیلم و حیکمـــەتی ئایـــات
مـــەنبـــەعـــی نـــوور و فـــەیـــزی بـــەرەکـــات
عالـــەم لـــە چـــەشمـــەی ســـەفـــا تێـــراوە
(نـــامی) نمێکـــی ئـــەوێ لـــەو ئـــاوە

## الوحيد

فــەرد و وەحيــد بــووی لــە ڕووی ئافاقــا
بــە عــیلم و عــەمــەل هــەم لــە ئــەخلاقــا

## الشاهد

تــا نيــدات بــۆ هــات لای خــودای کــەريم
(انـــــک لعلـــــی خلـــــق عظـــــيم)
شــاهيدی حــەق تــۆی بــۆ ئــەهلــی دونيــا
ئـــەمـــە ئـــەزانـــێ ئينـــسانی وريـــا
هـــــەروا شــــاهيدی لـــــە قيامـــــەتـــا
لــە ســەر (شـــهدا) لــەگــەڵ ئوممــەتـا
وجئنـــــا بــــــک علـــــی هـــــؤلاء
(شـــهيدا) بــەســە لای حــەق تــەعــالا
لــەبــۆ ئــەنبيــا بــە حــەق مــەشــهوودی
خـــاوەنی ئـــاوی (حـــوض المـــورود)ی
هـــەروا مـــەشـــهوودی لای خـــودای زانـــا
لــە ســەر کــاری حــەق بوويتــە تــەوانـا
(معــصوم) لــە (قــصور) گــەورە يــا بچــووک
لــە کــاری نابــار لــە ڕەزيلــەی ســووک
زاتێــک (مختــار) بــێ بــۆ فــەيــزی ئــەنــوار
دووره لــە گــەردی کــاری ناهــەمــوار

## البشير النذير

بــەشــیر مــوژدەدەر بــۆ تاعــەتکــاران
(نـــەذیـــر) ترســـێنەر بـــۆ تاوانبـــاران

## المطیع المطاع

(مطیـــع)ی ئــەمــری خــودای عالــەم بــوو
(مطـــاع)ی ســوپای پــاکی ئــەکــرەم بــوو

## الولی

(ولــی) بــوو بــە حــەق (صــدیق) و (ناصــر)
لـــەبـــۆ ئینـــسانی پـــاکی موناســـیر
(ولـــی معتـــق) بـــوو بـــۆ (رقـــاب) لـــە نـــار
لـــە ســـەر ئیتاعـــەی خـــالیقی غـــەففـــار
(معتـــق) بـــوو لـــەبـــۆ گـــەلـــێ لـــە بـــەنـــدە
لـــە موسولـــمانی پـــاکی دڵزینـــــدە
وەلی بـــوو لـــەبـــۆ هـــەمـــوو مـــوئمینین
موتـــەوەللـــی بـــوو لـــەبـــۆ قاســـیرین
فـــــەرزە بـــــزانی ویلایـــــەی عامـــــە
خاســـەی ڕەهبـــەری دیـــنی ئیـــسلامە

## الشهید

شەهید بووی بە حەق لە ڕووی دونیا و دین
لـــە لای ئـــەنبیـــا و لـــە لای مورســـەلـــین

## الشهير

زاتی شـــەهـــیر بـــوو مـــەشـــهووری دونیـــا
لـــە ســەمـا و زەوی لــە دەریـا ســەر ڕووی

## الصالح المصلح

الاخ الـــــــــصالح بـــــــــين الانبيـــــــــاء
المـــــــولی المـــــــصلح بـــــــين الاصـــــــفياء

## رۆوف رحيم

(رؤوف رحـــيم) بـــــوون بــــە ســــيفاتی
لــــە خـــوداوە بـــوون لــــە نـــاو ئايـــاتی
زاتێکـــــی وەهـــــا ئێـــــشی پـــیٚبگـــــا
ئـــەگـــەر ئوممـــەتی نێـــشی لـــیٚبـــدا
ئینـــسان بـــەڕاســـتی شـــەرمـــی پـــیٚئـــەویٚ
کاتـــیٚ ســـیفاتی بـــەرچـــاو ئـــەکـــەویٚ

ئـــــەو وا بـــــۆ ئێمـــــە (رؤوف) و (رحـــيم)
ئێمـــەش بـــەم شـــێوە بـــیٚشـــەرم و لـــەئـــیم

## الداعی

(داعـــی الـــی الله) ئـــەبـــیٚ ئـــاوا بـــیٚ
ڕۆژ لــــە حـــەيـــای ئـــەو بـــڕوا ئـــاوا بـــیٚ
(ســـاعی للهـــدی) پێويـــــستە وابـــــیٚ
ڕۆژ و شـــەو بـــانگی بـــۆ لای خـــودا بـــیٚ

داعـــی بـــۆ ســـفرەی خـــودا ئاوایـــە
قـــووتی مائیـــدەی تـــەقـــوای خودایـــە
داعـــی کـــەوابـــوو لـــەبـــۆ ماســـیوا
ئـــەبـــێ مـــەدعـــوو بـــێ بـــۆ لیقـــای خـــودا
ئـــەبـــێ مـــەدعـــوو بـــێ بـــە یاســـای میعـــراج
تـــا لـــە لای خـــودا وەربگـــرێ مینـــهاج
بـــۆ بـــەرزیـــی پایـــەی لـــە ســـەر فـــەلـــەکـــا
بـــۆ نـــوور پـــەخـــشانی بـــە ســـەر مـــەلـــەکـــا
نـــەک لـــە لای ســـیدرە لـــە عـــەرشـــی عـــالی
نـــوور پـــەخـــشانی کـــرد لـــە ســـەر عـــەوالی
بۆیـــە بـــە وێنـــەی بـــەرقـــی (فـوق النـور)
زوو هاتـــەوە خـــوار لـــە ڕێ ســـەرەوژوور

## الشفیع

شـــەفیـــع بـــەڕاســـتی یـــانی تکاکـــار
چ بـــۆ موسوڵـــمان، چ لـــەبـــۆ کوففـــار
بـــۆ ڕزگـــار بوونیـــان لـــە زاکـــەی زەحمـــەت
لـــە عـــەرەســـاتا بـــە فـــەیـــزی ڕەحمـــەت
شـــەفیـــع بـــوو لـــەبـــۆ تاوانبـــارەکـــان
لـــە ئـــەهلـــی ئیمـــان جـــەفاکـــارەکـــان
شـــەفیـــع بـــوو لـــەبـــۆ بـــەرزیـــی دەرەجـــات
هـــەرکـــەس بـــە قـــەد خـــۆی کـــاتی موناجـــات

## الكريم

وەکوو لای مەخلووق لای حەق عەلیم بوو
لە کەرەم (مشتق) خاوەن تەکریم بوو
دەریا و جێ وشکان بە کەرەمی ئەو
هەموو وەریان‌گرت بەرگی تازە و نەو
کاتێ قەدەمی نایە سەر زەوی
شەیتان شەیدا بوو سەری دانەوی
وتی: ئەی هاوار هەرچەند لە نارم
لە نووری ئەحمەد دڵ بێقەرارم
نووری کەرەمی ئەوەندە بە تاوە
سەرتاپای لەشم هەموو سووتاوە
سا خودا بە حەق کەرەمی ئەحمەد
بمانپارێزە لە ناری ئەبەد
کەرەمی گەیشت بە مردوو بە حەی
نەما شۆرەتی سەخای بەنی‌تەی
ئەو فەیزی نوورە ئەو کردی بۆ عام
بە دامەزرانی ئایینی ئیسلام
نە شەماڵ ئەیکا نە بای ڕەشەبا
شەماڵ و کەماڵ کوجا مەرحەبا
سا خودا لە بەر نەسیمی خەیری
سروەی کەرەمی بە سەفا و سەیری
بگا بە دەماخ بۆ دەوای (نامی)
بەڵکوو دامەزرێ لە سەر ئیسلامی

## عين العز

عیــززەت لــە ئــەو بــوو گــەیــشتە تــەرەف
لــە ســەلــەفــەوە گــەیــشتە خــەلــەف
بۆیــــە بــــە (عــــین العــــز) نــــاو بــــرا
عیــززی ئــەو گــەیــشت بــە بــاوک و بــرا
جــا زاتــێ عــەیــنی عیــزز و شــەرەف بــێ
ئــەبــێ کائینــات بــۆ ئــەو ســەدەف بــێ
دونیــــا دەریایــــە تــــەرەف بــــە تــــەرەف
ئــادەم ســەدەف بــوو ئــەو دوڕڕی شــەرەف
ئــەو زاتــە عــەیــنی عیــزز و شــەرەف بــوو
عینــوانی مــەجــدی هــەمــوو ســەلــەف بــوو
مایــەی تــەنــویری ڕۆحــی خــەلــەف بــوو
بــۆ کــوفر و عینــاد مایــەی تــەلــەف بــوو
مــەکــین بــوو لــە ســەر بــورجی تــەمکینــا
ئــەمــین بــوو بــە حــەق لــە دونیــا و دینــا
(ســــید الکــــونین) لــــە هــــەر دوو دنیــــا
(مــــولی الثقلــــین) بــــە لــــوتفی خــــودا
موبــەللیغــی دیــن بــە ئــەمــری بــاری
بــۆ پــەری و ئینــسان ســابیت و ســاری
ئەمــین بــوو لــە ســەر شــەرعــی خــوداوەنــد
مــوعین بــوو لــەبــۆ شــەخــسی دەردەمــەنــد
(رحمــــة الله) بــــۆ هــــەمــــوو عالــــەم
مــەخــسووس بــۆ پــەری و بــۆ بــەنیئــادەم

نعمـــــــــة الله للــــــــــدنيا والـــــــــدين

بالمـــــــال والحـــــال بعلـــــم اليقـــــين

ســابيق لــه عالــەم بــۆ بــابى ئيحــسان

ســابيقى ئوممـــەت بـــۆ ڕەوزەى جنـــان

(هديـــه الله) بــــەڕاســــتى وايـــــه

بگـــات بـــه عالـــەم بـــه پايـــه و مايـــه

(روح‌الحـــق) يـــانى ڕۆحـــى ســـەفـــا بـــوو

مايـــەى ســيفەتى عـــەهـــد و وەفـــا بـــوو

ئـــەم چـــەنـــد ناوانـــه وتمـــان بـــه كـــوردى

دەى بـــا عـــەرەبـــيش بكـــا بـــه ويـــردى

رحمــــــــه الله علـــــــــى الانــــــــام

بهـــــدى الـــــدين الحــــق الاســـــلامى

رحمـــــــــه الله علـــــــــى القلـــــــوب

بــــــــدفع الهــــــــوى أم الــــــــذنوب

رحمـــــــــه الله علـــــــــى الـــــــضعفاء

برحمتـــــــه العامـــــــه الوفـــــــــاء

رحمـــــــــه الله علـــــــــى المـــــــساكين

رحمـــــــــه الله علـــــــــى الـــــــسالكين

يــــرحم اهـــــل الـــــصفا بالـــــصفه[٢١]

بنـــــشر كـــــل مـــــا فيـــــه الألفـــــه

نعمـــــه الله فــــــى الــــــدنيا و الـــــدين

لمـــــــن يطيـــــــع رب العـــــــالمين

---

[٢١]. **الصفه:** سەكۆيەكە لە پشتى حوجرەى حەزرەتەوە.

السابق الی میدان الطاعه
بما لدیه من استطاعه
السابق الی میدان الجهاد
کالسبق الی الوعظ و الارشاد
بارشاده العام النافع
لکل شخص سام سامع
بارشاده العالم المقیاس
بالنور المنجی عن الوسواس
هدیه الله الی الانام
بهدیه الدین الاسلامی
و روح الحق یعنی انه
رحمه الله کانت عنده

## نەفحەی قودسی بوو کە (ابن مریم) زیندووی کردووە مردووی موکەڕڕەم

ورسولنا علیه السلام
عنده ذاک بنور الاسلام
السابق الی رب العباد
للسعداء من العباد
وهو المتین وهو المقدس
وهو المبین للشرع الاقدس
ناصر الحق، ناشر الهدی
کاسر العنق لأهل الردی
وهو المنصور من الاله
بالملائکه مع التباهی

وهـــو الـــشفيق مـــع الاصـــحاب
وهـــو الرفيـــق مـــع الاحبـــاب
صـــاحب المعـــراج عنـــد المناجـــات
صـــاحب العـــلاج لاهـــل الحاجـــات
بـــر محـــسن فـــضلا مفـــضل
بفـــضل البـــاری قـــد عزوجـــل
(مـــوجيبی) ئـــەمـــری زاتی خـــودا بـــوو
(مجـــاب الـــدعاء عنـــد الـــدعاء) بـــوو
وەكيـل بـوو لـە سـەر ئومـووری ئوممـەت
بـۆ ئـەدای فـەرز و بـەرائـەی زیممـەت
موبـــەيـــين لـــەبـــۆ ئايـــاتی قورئـــان
لـــە سـەر فـەرمـانی (ملـك)ی (منـان)
بـــسنته العليـــا المتينـــه
بالعبـــادات العليـــا المبينـــه
(مقـيم)ی سـونئەت لـــە سـەر (اعتـدال)
بـە (قـول) و (فعـل) و (تقريـر)ی ئـەحـوال
لـــە سـەر فـەرمـانی قورئـانی (مبـين)
ڕێـی ئیجتیهـادی كـردەوە بـۆ دیـن

(مـصيب) و (مخطـئ) ئـەجـری بـۆ دانـا
مـادام (مجتهـد) عادڵـە و زانـا
ئـەو بـڕیاری دا (اجمـاع) بـۆ حوجـجـەت
زەلالـەی عومـووم دوورە لـە ئوممـەت

(عـصمت)ی دانـــا لـــەبــۆ ئـــەنبیـــا
حورمـــەتی دانـــا لـــەبـــۆ ئـــەولیـــا
ئـــەو قـــەراری دا بـــۆ ڕۆزگـــاران
خۆشـەویـستی (خـوا) و ڕەهبـەر و یـاران
مـەحـەببـەی ئـەهلـی عـیلم و عـەدالـەت
دووری لـە ئـەهلـی جـەهـل و زەلالـەت
ئـــەوەی لـــەم یاســـا ملـــی بـــا ئـــەدا
ئـــەوە گومڕایـــە و لـــە ڕێ لا ئـــەدا
(فاضـل) (مفـضل) لـــە ئـــەهلـــی دینـــا
لـــە نـــاو ئـــەنبیـــای خـــاوەن تـــەمکینـــا
(وجیـــە)ی خـــاوەن جاهـــ و (ئیعتیبـــار)
بـــۆ دونیـــا و بـــۆ دیـــن و بـــۆ (یـوم القـرار)
(صـادق) لـــە هـــەمـــوو کـــار و وتـــارا
لای خـــەلـــق و خـــالیق لـــە ڕۆزگـــارا
(مـصدق) لـــە لای خـــودا و عیبـــادا
واتـــە لای هـــەمـــوو خـــاوەن ڕەشـــادا
(کامـل) بـوو بـە حـەق بـە زات و ئـەوسـاف
مـــەعلوومـــە لـــە لای ئـــەربـــابی ئینـــساف
دینـــێ کامیـــل بـــێ لـــەبـــۆ کامیلـــە
فـــەیـــزی تـــەکمیلـــی ڕەســـا و شـــامیله
بۆیـــە گـــەورەی کـــرد خـــوا لـــە ســـەر کـــول
بـــوو بـــە خاتـــەمـــی ئـــەنبیـــا و روســـول
لـــەبـــۆ سیلـــسیلەی ئـــەنبیـــای (کـرام)
بـــوو بـــە خاتیمـــەی (احـسن الختـام)

خامەت کەرەم کرد بۆ نامە و تەحریر
بەبێ نامەی من بە خامەی تەقدیر
ئەپارێمەوە بە فەیزی زاتت
لە سەر تەجەللا و جیلوەی سیفاتت
(نامی) ببەخشە بە وەسفی (ئیکرام)
موشەڕڕەف ببێ بە حوسنی خیتام
ئەمجارە نۆبەی تکا و ڕجایە
پەنا هێنانە و ڕێی ئیلتیجایە
ئەی مەولای ئەولای ئەهلی سەعادەت
فاتیحی دەرگای ڕجا و شەفاعەت
ئەی سەرداری حەق لە دوو جیهانا
غەمخۆر و دڵسۆز بۆ کاتی هانا
(نامی) بە وێنەی شەخسی نەخۆشە
ئەسیری نەفسە و بێفیکر و هۆشە
وەکوو منداڵی لە خاوەن بڕاو
یا وەکوو هەتیو بێدایە و بێباو
وەسیلەم تەنیا فەزیلەی تۆیە
ڕەحم و مەحەببەت لە لای تۆ کۆیە
ئەزانی ئەوزاع چۆن لە ناوا
دونیا وا لە ناو جۆشی هەتاوا
هەتاوی گەرمای سەبوونی مەینەت
لە بەر شەقاوەی گەلی بێبەینەت
بە دەستی پەستی تاوانی خۆمان
دونیا تاریک بوو بە جارێ لێمان

ئەپاڕێمەوە بۆ چەند (مهمات)
ئاسانیان بکا خودای کائینات
یەکەمین کەرەم لەبۆ ڕزگاری
لەم جۆشی چەرخە کە بۆمان باری
دووەم ئیعادەی دەراسەی عولووم
بۆ (طلاب)ی دین بە شێوەی مەعلووم
سێهەم مەبەستی (خادیم)ی (نامی)
لە سەر تەوفیقە و حوسنی خیتامی
گەورەم سەردارم پەنای دونیا و دین
مەحبووبی خودای (ربالعالمین)
تەمەنم سەرکەوت لە هەشتا سالی
هێشتا وام لە سەر تەبعی منالی
نە نیشاتێکە لە سەر عیبادەت
نە دەرچوونێکە لە یاسای عادەت
وەک پێ‌نەگرتوو ئەڕۆم بە ڕێدا
نەڕۆم و ماوم لە عەینی جێدا
گەلێ موحتاجم بە دەستی بەرزت
دەستی کەرەمی سەما و سەر عەرزت
دەستیشم ناگا بە دەستەکانت
لە بەر بولەندی پایە و مەکانت
بیکە بە خاتر پایەی بەرزی خۆت
ڕەئفەت و ڕەحمەت کە دایناوە بۆت
لا بکەرەوە جارێ بە لاما
نەمرم لە گێژی دەرد و ئالاما

دەســـتی بـــەرزی خـــۆت بـــدەرە دەســـتم
بـــە مـــادە و مـــەعنـــا دامـــاو و پـــەســـتم
منـــداڵ هـــەرچـــۆن بـــێ ڕیعایـــەت ئـــەکـــرێ
بابـــەی میهـــرەبـــان دەســـتێکی ئـــەگـــرێ
ئـــەگـــەر دەســـتی تـــۆ بگـــا بـــە دەســـتم
ئیتـــر ئـــەزانم لـــە جـــەفـــا ڕەســـتم
بـــە ئـــەلتـــافی خـــۆت بـــە فـــەیـــزی عـــامی
تـــاوێ بڕوانـــە بـــۆ چـــارەی (نـــامی)
ببـــارێ لـــە ســـەر ڕۆحـــی شـــەریفـــت
ســـەلامـــێ بـــشێ لـــەبـــۆ تـــەشـــریفت
لـــە ســـەر یـــاران و ئـــال و پـــەیـــڕەوان
(نـــامی) داخـــڵ بـــێ لـــە زومـــرەی ئـــەوان
پایـــانی کـــەلام ســـەلات و ســـەلام
شـــیعارە لـــەبـــۆ (أحـــسن الختـــام)

***

تەواو بوو بە یارمەتی خوای گەورە نووسینەوەی ئەم هۆنراوانەی بە ناو (سکالایە) کە دەستەیەک وەنەوشەی سکالایە، بە ناوی خوا و (رسول الله)یە ڕۆژی پێنجشەممەی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٤٠٦ی کۆچی. ڕێکەوتی سی مانگی یازدەی هەزار و نوسەد و هەشتا و پێنجی زایینی (١٩٨٥/١١/٣٠ م) لە مەدرەسەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی خوای لێ ڕازی بێت.

***

وانا الفقير المدرس بالمدرسه المزبوره عبدالكريم محمد ابن فتاح ابن مصطفى ابن سليمان ابن محمد الكردى الشهرزورى من عشيره القاضى القاطنه فى مركز ناحيه السيدق صادق.

وصلى الله على سيدنا محمـد و آلـه و صـحبه اجمعـين، و آخـر دعوانـا ان الحمـد لله رب العالمين.

# دوا لاپەڕە

كە مامۆستا مەلا عەبدولكـەريم نووسـينەوەی كتـێبی: (سـەنـا و سكالا) و سەرپەرشتی چاپی خستە ئەستۆم، لە كاتی نووسـينەوەيـدا خەيالی ئەو هۆنراوانـەی خـوارەوە گرتمـی... بۆيـە نووسـيمەوە بـێ گوێدانە هەندێ ناتەواوی:

وەك باسـی ئـەكـا مامۆسـتای (نـامی)

ئـەشـقی پـيرۆزی مـەولانـای جـامی
خوايـە لـەو ئـەشـقە منـيش بـەشـم بـێ
هـەوێـنی هـەوڵ و هيـوای گـەشـم بـێ
بـە مايـەی پـووچ و دڵـی بۆسـۆوە
بـە نووسـينەوەی سـكالای تـۆوە
سـەنـای ڕابـەر و سـەنـای يـارانی
يـارانی ڕێگـای بـەرزی ئينـسانی
چـاوەڕێـی تـۆزی نمـی ڕەحمـەتم
چونكـە غـەرقـی نـاو تـۆزی مـەينـەتم
ئـاخر هـەواری ئـازار و شـينم
دەنگـی گريانـە قاقـای كـەنيـنم
بـاری خامۆشـی و هـەم نـەزانيـنم
كردوويـەتـە خـەو بيـداری ژيـنم
واتـە ڕۆژيـشم هـەر وەكـوو شـەوە

چـــارەم شـــەوقێکـــی نـــووری پڕتـــەوە
تکـــــــای (بوصـــــیری) دایم تکامــــــــە
لـــە بـــارەگـــادا یـــەکـــە نزامـــە
واتـــە کـــە سالـــح ناسالـــح مـــاوە
تـــۆ ســـۆزت بـــە پێـــی تـــاوان دانـــاوە
چـــون لـــەوەی توێـــشەی ڕێبـــواری ڕێیـــە
تـــەنیـا بـــەیتـــەکـــەی (مـــەولـــەوی)م پێیـــە:
«یـا خـــەلیـل دەخیـل کـێ عـادەت کـەردەن
تۆشـــە وە دەرگـــای کـــەریمـــان بـــەردەن»

***

(محمد صالح) مەلا حەسەنی هۆرێنی